سەرچاوە:
George Orwell
ANIMAL FARM
LONOON 1987
Published by planet
(Part of great Read)

ناوی کتێب: مەزرای ئاژەڵان
نووسینی: جۆرج ئۆروێڵ
وەرگێڕانی : ئەدیب نادر
بابەت: ڕۆمان
مۆنتاژی کۆمپیوتەر: سەیران عەبدولرەحمان فەرەج
هەڵەچنی: سارا عەبدوڵلاّ
تیراژ: 1000 دانە
نرخ: 3000دینار
ژمارەی سپاردن: 877 ی 2007
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
چاپی : یەکەم ساڵی 2008
کوردستان -سلێمانی
www.serdam.org

جۆرج ئۆرویل

# مەزرای ئاژەڵان

وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە

**ئەدیب نادر**

سلێمانی 2008

## لە قەبێڵی دەستپێکدا:

(جۆرج ئۆروێڵ) ناوێکی لە پێناسە بەدەرە، نەوەك هەر لە نێوەندەکانی ئەدەبیاتی ئینگلستاندا, بەڵکو لە مێژووی ئەدەبیاتی سەرتاپای جیهانیشدا پایەیەکی تۆکمەو بڵندی بەرزەفت کردووەو بە یەکێك لەو بەهرەمەندو خەڵقەندە بێ وێنەو بەسەلیقانە دێتە شومار کە زێدە بە وریایی‌و کارامانە توانیوێتی لە دانراوو کارە بەشۆرەتە سەرسامهێنەکانی خۆیدا پێشبینی ئەو وەرچەرخانە نەگەتیڤانە بکات کە دەسەڵات بەسەر فیکرو هەڵسوکەوت‌و ئەو ڕەوشە سیاسیەدا دەیهێنێ کە بەدوای ڕاپەڕینێك یاخود یاخیبوونێکدا دێت‌و بەتایبەتیش ئەوانەی کە شەڕی دووەمی جیهانی بەدوای خۆیدا دەیانهێنێ‌و بەردەوامییەکی خەیاڵئامێزش بەخۆوە دەبینێت. شایانی ئاماژەپێکردنیشە کە ئیقاعێکی دانسقەو تایبەتمەند بەسەر بەشێکی زۆری نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا زاڵ دەکات‌و بەشەکەی تریش بە بەرجەستەییەوە دەخاتە نێو پانتاییە هزرییەکانی پشبینییەوە.

ئۆروێڵ بەو شرۆڤەو لێتوێژینەوە قووڵ‌و سایکۆلۆجیەی کە بۆ کارەکتەرەکانی ئەنجامی دەدات‌و تەنزئامێزانە مامەڵە لەگەڵ هەڵکشانی کێرڤی لادانەکان دەکات بەرەو پێشێلکردن‌و دەست لێ کشانەوەی کۆمیتمەنت (پابەندبوو)ی شێلگیریان دەرهەق بە مۆراڵی سەردەمی ڕکابەرایەتی‌و خەباتیاندا ڕەنگدەداتەوە،

هەروەك لە كاراكتەرەكانی (Big Brother ی ڕۆمانی 1984)و ( comrade Napoleon ڕۆمانی مەزرای ئاژەڵان)دا دەردەكەون.

ئەگەرچی لەڕاستیدا ئەدەب توانای ئەوەی نیە كە دونیاكەمان بۆ تورهەڵداتە نێو بۆتەی گۆڕانكارییەكی ماتێریالیانەوە، لەگەڵ ئەوەشدا بوێری ئەوەی هەیە كە ئەو شتانەمان بۆ بخاتە بەر تەتەڵەی تێڕوانین كە پێداویستییەكی پەیگیریان بەو گۆڕانكارییە خۆسەپێنەرە هەیە، هەروەكو لە دەقەكانی ئۆروێڵدا بەدیار دەكەوێت و جیهانێكی جوداواز بەرچاو دەخەن كە دەبێتە هۆی ئەوەی پانتایی تێكست وەزیفەیەكی مەعریفی ئەنجام بداتو تەقەلا بكات كە بەسەر لێكدابڕانی ئەدەبو ژیانی هاوچەرخدا دەستباڵا بێتو شەقلگیری بە واقیعێك ببەخشێت كە ئاتاجی بە گۆڕانكاری هەیە.

ئەوی ڕاستی بێ پلانو تانوپۆی دەقەكانی ئۆروێڵ هانمان دەدات بكەوینە تێفكرینێكی جیددی ترو گەڕانێكی پەیگیرتر بە دووی سەرچاوەدا، سەرچاوەی ئەسڵی بیرۆكەی بەكارهێنانی گیانەوەران وەكو ئێگزیستی گوزارشتكەرو دەربڕی تیمەیەك كە ڕەگ وڕیشەكەی دەچێتەوە ناخی (كلیلەو دمنە)و حیكایەتە هیندییە دێرینەكانو دووریش نیە كە ئەمانە چاوگەو زەمینەی ڕەسەنو دنەدەری بنچینەیی ستراكتۆری چیرۆكی (مەزرای ئاژەڵان)یش بووبن. ئۆروێڵ لە ڕێگای بنیاتنانەوەی واقیعێكی پیادەكراودا دیسانەوە لە ئەتمۆسفیری خەیاڵدا وەقایعەكان تەرتیبو ڕێكدەخاتەوەو بە ئەزموونی هیومانی تێهەڵكێشیان دەكاتو لەنێو فەزایەكدا ئاوقامان دەكات كە فەزای فانتازی ئامێزی تایبەت بە خۆیەتیو

ئەگەرچیش بە فۆرم ڕمۆکو نامۆیە, بەڵام بە ناواخن دەستەمۆو خواساییە. بێگومان لە چرکەساتی بەیەککگەشتنەوەی فۆرمو ناوەرۆکیشدا، یاخو بابڵێین دەرەوەو ناوەوە جەستەو ڕۆحی یەکانگیرو لووای تێکستەکەدا پەیوەستی سەرەوە بە خوارەوەو پێچەوانەکەشیو پەیوەستی خوارەوەش بە خوارەوەدا لە شەقڵێکی بەرجەستەدا وێنا دەکاتو ئیدی جێگا بۆ نادیارێك لە هزماندا ناهێڵێتەوەو ئاسەواری هەموو پشت پەردەبوونییەك دەرەوێنێتەوە.

لەم ڕۆمانە کورتە پڕ شیفرەیەدا زەمەن ڕەوتی سروشتی خۆی گرتۆتەبەرو بەرەو ئایندەیەك دەڕوات کە ئافەریدەی پێشبینیەو بەهێوری لۆیەکانی خۆی دەکاتەوەو لە یەك شتی زۆر بە بایەخدا دەستبەرداری بزاڤە دیالێکتیکییە مێژووییەکەی خۆی دەبێت کە ئەویش ژەنگھەڵهێنانە لە تانوپۆی نەگۆڕانو کرەکی لەخۆگرتنی بزاوتی کۆمەڵایەتی پاش ڕاپەڕینی ئاژەڵان لە دژی (مستەر جونز)... و ملدانی سەرجەمی ئاژەڵان بۆ گشت جۆرە چەوساندنەوەو ستەمێك کە خۆی لە داهێزرانو زێدەڕەویی لە کارکردنو کەمخۆریدا دەبینێتەوەو هەروەها چەپاندنو داپڵۆساندنیشیان لەلایەن پاسەوانانی هەڤاڵ ناپلیۆنەوە کە سەگەکاننو لەمانەش سەیرتر هەر هەموو دانپیانانی هەندێك لەو ئاژەڵانە بەوەی کە لە دەسیسەیەکدا هاوبەشیان کردووە کە مەبەستی زاڵکردنەوەی ئادەمیزاد بووە بەسەر گیانەوەراندا، کە گومان هەڵنەگرە دانپیانانێکی لە ڕاستی بەدەرەو هەقیقەت لەخۆوە دادەماڵێت. لە ئانوساتی هەڵدانەوەی فەسڵەکانی ئەم شاکارەدا وەرگر دەبێتە تاقیگایەك بۆ بەراوردکاریکردنی دەقاودەق لەمیان کاراکتەرەکانی

ئەم ڕووبەرە بەپیتو فەرەو هەندێك لە سەرکردە تۆتالیتارەکانی دنیادا، وشە بە وشەو پار بە پاری نۆڤلێتێکی تەنزئامێزی چەشنی (مەزرای ئاژەڵان)دا بەرقەرار نەکاتو نەکەوێتە نێو بۆتەی ئەوەی کە لە هەمان کاتدا لە ناوەهایەکی وەکو (ستالین، کاسترۆ، چاوچیسکۆ)و چەندینی دیکەش تێنەفکرێت، تەنانەت لە هەندێ حاڵەتیشدا هەستێکی ئەوتۆ دایدەگرێت کە ئەوە پڕ بە پێست ئەوانەن کە ڕووبەری تێکستەکانی ئۆروێڵ دەخەنە ژێر کاریگەری توندو پەیگیری خۆیانەوەو نەخشەسازی بۆ سیستەمێکی خوێناوی لە جیهانە ئافەریدەکراوە ناوازەکەیدا دەهێننە دی.

ئۆروێڵ کە تەمەنێکی کورت ژیاوە (1903-1950) هەڵگری ئایدیاو ئەندێشەیەکی هیومانیو داکۆکیکارانە بووە بەرامبەر بە چینو توێژە پلیشاوەو زەوتکراوەکانی ژێرەوەی کۆمەڵگاو بیروئاوەزی وایان لێکردووە کە لە چەندەها بزاڤی شۆڕشگێڕانەی وڵاتانی دیکەدا جێپەنجەی بەجێ هێشتبێ، لەوانە (بۆرما) کە بووە بە هەوێن و فاکتەرێك بۆ هێنانەگۆڕێی فیکشنی (ڕۆژە بۆرمیەکان 1934)و بەشداریکردنی لە شەڕی ناوخۆی ئیسپانیاشدا کە لە (لێگەڕێ با ئەسپی دیسترا بفڕێت- 1936)و سەرجەم نووسینەکانی دواتریشیدا بۆتە مایەی ڕەنگدانەوەو ئامادەبوونێکی بەرجەستە. ئەم دەقە حازریەش (مەزرای ئاژەڵان- 1943) دەقێکە چەشەو پەندی هەمەلایەنە بە وەرگر دەبەخشێو جوداوازییەك لە زەینو تێفکرینیدا دەهێنێتە کایەوە.

لە هەقیقەتدا وەرگێڕانی ئەم دەقە ڕووبەڕووی کێشەو گرفتی گواستنەوەی ئەو فەزا دەوڵەمەندەی فۆڕمو ناواخنی نووسەرێکی تواناداری وەکو ئۆروێڵی کردمو تێکستە وەرگێڕاوەکە لە منالّدانی زەحمەتێکی زۆرەوە هاتە بوون کە ڕاستەوخۆ لە زوبانی نووسەرەوە، دانگەڕێژەی دووتوێی ئەم کتێبەوە، وەکو هەڵوێستی بەردەوامیشم لە پەیوەندیداربوون بە کەشوهەواو خەسڵەتو نویشکی نووسەرەوە تەقەلایەکی کەللەشەقانەم داوە کە وەکو ئیگۆیەکی ئامادەو سەربەخۆی پێداگر لەو نێو بەینەدا خۆم بە کالّبوونەوە بسپێرمو یەکسەر داهێنانکاریی جۆرج ئۆروێڵ بهێنمە نێو پڕۆسەی خوێندنەوەوەو لەو بڕوایەشدام کە ئەم دەقە وەکو وەرگێڕانە فارسیو عەرەبیەکەی خوێنەری بە ئەزموونی ئێمە لە هەستی پەژیوانییەکەوە ناگەوزێنێت کە بەدوای خوێندنەوەیەکی ناخۆشنوددا دێت.

ئەدیب نادر

لەندەن 2006/9/12

# بەشی یەکەم

مستەر (جۆنز)ی خاوەنی مەزرای (مانەر) بۆ شەو کولانە مریشکەکانی کلۆمدا، وەلێ لەوە مەستتر بوو کە بە یادیدا بێتەوە ڕۆچنەی- هاتوچۆکان دابخات. لەگەڵ هەڵقەی ئەو ڕووناکییەی کە لە فەنەرەکەیەوە لەملاوە بۆ ئەولا سەمای دەکرد سەرتاسەری حەوشەو بانەکە ساتمەی دەدا، لەلای دەرگاکەی پشتەوە شەقی لە پووتەکانی خۆی هەڵدا، دوا پەرداخە بیرەی لە بۆشکەی نێو سکەلەرییەکە[1] دەرکێشاو بەرەو پێخەفەکە ڕێی گرتەبەر کە مسس (جۆنز) دەمێك بوو لەوێ پرخەی دەهات.

هەر کە ڕۆشناییەکەی نێو ژووری نووستنەکە خامۆش بووەوە لە سەرانسەری هەموو خانووبەرەکانی مەزراکەدا وروژان و پەشێوییەك لەئارادا بوو. لەمیانەی

---

[1]. Scullery: ژووری تەنیشت چێشتخانە.

ڕۆژەکەدا باسوخواس بڵاوبووەوە کە (مەیجەر)ی بەساڵداچوو بەرازە یەکانە نیمچە سپییە بەویقارەکە لە شەوی پێشووتردا خەونێکی سەیرو عاجباتی بینیبوو، ئارەزووی ئەوەشی دەکرد کە بە ئاژەڵەکانی دیکەی ڕابگەیەنێت. هەمووش لەسەر ئەوە کۆك بوون هەر کە مستەر جۆنز بە دڵنیاییەوە لە ڕێگاکە بەدەر بوو، پێویستە سەرجەم لەنێو تەویلە گەورەکەدا کۆببنەوە.

مەیجەری بەساڵداچوو (کە ئەو هەردەم ئاوا ناودەبرا. ئەگەرچیش ئەو ناوەی کە ئەو پێی بەدیار کەوتبوو-ویلینگدۆن بیوتی- بوو) لە مەزراکەدا فرە پایەبەرز تەماشا دەکرا, هەموو کەسێکیش بەتەواوی ئامادەبوو کاتژمێرێکی نووستنی لەکیس بدات، بۆئەوەی گوێبیستی ئەوە بێت کە ئەو دەیەوێ چی بڵێت.

لە سەرێکی تەویلە گەورەکەدا، لەسەر شتێکی چەشنی سەکۆی بڵندکراو مەیجەر دەمێك بوو لەسەر جێخەوە پووشو پەڵاشینەکەی ژێر فەنەرێکدا کە بە کۆڵەکەیەکەوە ئاوقا کراو جێگیر ببوو. تەمەنی دوازدە ساڵان بوو بەو دواییەش نەختێك تەنگەستوورتر هەڵگەڕابوو، وێڕای ئەو هەقیقەتەش کە هەرگیز کەڵبەکانی نەبڕابوونەوە، کەچی هێشتاکەش هەر بە بەرازێکی شاهانەی هزردارو خێرخوا دەچوو.

---

2. Major.

3. Willingdon Beauty.

پاش ماوەیەکی کەمخایەن گیانلەبەرەکانی دیکەش دەستیان بەهاتن کردو لە دواوەی پایە کۆمەڵایەتییە جیاوازەکانی خۆیاندا ئاسوودەییان بەخۆ بەخشی. یەکەمین سێ سەگەکە هاتن (بلوبێل، جێسی و پینچەر)، ئینجا پاشتر بەرازەکان، کە بەبێ سێ و دووکردن لەنێو پووش و پەڵاشەکەی بەردەم سەکۆکەدا سەقامیان گرت. مریشکەکانیش خۆیان لەسەر تاقی بەر پەنجەرەکاندا هەڵکورماند. کۆترەکانیش بە شەقەی باڵەفڕە چوونە سەر دارەڕای ساپیتەکە، مەڕو مانگاکانیش لەدوای بەرازەکانەوە هەڵاژانو کەوتنە کاوێژکردن. هەردوو ئەسپی گالیسکەکە (بۆکسەرو کلۆڤەر) پێکرا هاتنە ژوورەوە، گەلێك لەسەرەخۆ هەنگاوی هەڵناو سمە تووکنە فرە زلەکانی خۆیانیان بە ئاگاییەکی مەزنەوە جێگیر کرد نەبادا لەو ناوەدا هەندێك ئاژەڵی بچکۆلانە لەنێو پووش و پەڵاشەکەدا شارابنەوە.

(کلۆڤەر)ماینێکی دایکانەی بەخۆو تێکسمڕاو بوو. تەمەنی خەریکبوو لە نێوەندی ژیان نزیك دەکەوتەوە، کە لە ڕاستیدا پاش چوارەمین جوانووی هەرگیز قەدو باڵاو هەیکەلەکەی جارانی وەدەست نەهێنایەوە. (بۆکسەر) گیانەوەرێکی زلحۆرت بوو، نزیکەی هەژدە هاندا[4] بەرز دەبوو، بەهێزیشی بە ئەندازەی دوو ئەسپی خواسایی لەیەکدراو دەبوو. خەتێکی سپیکەلانە لە خوارەوەی قەپۆزیەوە تاڕادەیەك دەرکەوتێکی گەمژانەی پێ بەخشیبوو، لە ڕاستیشدا خاوەنی

---

[4] . Hand: یەکەیەکە بۆ پێوانی بەرزیی ڕەشەوڵاخ بەکاردەبرێتو هەر (هاند)ێکیش بە چوار ئینج یەکسانە.

هۆشیارییەکی پلە یەك نەبوو، بەڵکو بەگشتی لە سۆنگەی مەحکەمەیی کاراکتەرو توانای سەر ئاسای ئیشکردنیەوە ئوودای دەگیرا. پاش ئەسپەکانیش (میوریەڵ)ی گیسکە سپیو بێنجامینی بە تەمەنترینو بەدفەسالترین ئاژەڵی سەر مەزراکە بوو. بەدەگمەن دەئاخاوتو کاتێکیش کە داخێوت عادەتەن بۆ ئەوە بوو کە هەندێ تێبینی گاڵتەجارانە بخاتەڕوو- هەر بۆ نموونە ئەوەی دەوت کە یەزدان کلکێکی پێبەخشیوە تاکو مێش ومەگەزەکانی پێ دوور بخاتەوە, کەچی ئەویش بە زوویی نە کلکی دەمێنێتەوە, نە مێشو مەگەزیش. هەر بە تەنیا ئەو لەمیانی ئاژەڵەکانی سەر مەزراکەدا قەتاوقەت پێنەکەنی بوو, گەر لێی بپرسرابایە لەبەرچی؟ دەیوت لەبەرئەوەی کە شتێکی ئەوتۆی نەبینیبوو تاکو پێی پێبکەنێ. بەم حاڵەشەوە بەبێ ئەوەی کە بەڕاشکاوی دانی پێدا بنێت، خۆی بۆ بۆکسەر تەرخان کردبوو، هەردووکیان عادەتەن یەکشەممەکانیان پێکەوە لەنێو حەساری بچکۆلەی ئەودیوی باخەکەدا بەسەر دەبرد، هاوشان دەلەوەڕینو موتڵەقەن ورتەشیان لێوە نەدەهات.

هەردوو ئەسپەکە تازە پاڵکەوتبوون, ئەو دەمەی کە ئەو بەچکە مراوییانەی کە دایکیان لەدەستدابوو بە قەتارەوە هاتنە نێو تەویلەکەوە، بە کزو مەلولییەوە جوکەجوکیان لێوە دەهاتو لەملاوە بۆ ئەولا دەهاتنو دەڕۆشتن هەتا جێ داسەکنانێك بدۆزنەوەو تیایدا نەپلیشێنرێنەوە. کلۆڤەر شێوە دیوارییەکی بە قاچە زەبەلاحەکانی پێشەوەی لە زێواریاندا کردو بەچکە مراوییەکانیش لەنێویدا قەراریان گرتو یەکسەر خەو بردیانەوە. لەدوا چرکەساتدا (مۆڵی)ی ئەو مایینە

چەرمووە جوانکیلە گەلۆرەی کە گالیسکەکەی مستەر جۆنزی ڕادەکێشا بە نازو کرۆشمەو کەشخەییەوە کە بە کرۆژتنی کلۆ شەکرێکەوە سەرقاڵ بوو هاتە ژوورەوە. نزیك بە ڕیزی پێشەوە شوێنێکی گرتو کەوتە بزواندنی یاڵە سپیەکەی بەو هیوایەی کە سەرنج بەلای ئەو شریتە سورانەدا ڕابکێشێت کە پێیەوە هۆنرابوونەوە. دوای هەموو کەسێکیش پشیلەکە هات. وەك خوونەریت بۆ گەرموگورترین جێگا چاوێکی بە دەوروخولدا وەرچەرخاندو سەرەنجام خۆی لە مابێنی بۆکسەرو کلۆڤەردا سیخناخ کرد، ئا لەو جێیەدا ڕەزامەندانە بەدرێژایی گوتارەکەی مەیجەر مرەمرِی کرد بەبێ ئەوەی گوێ بۆ تاقە پەیڤێکیش ڕادێرێت کە ئەو دەیئاخاوت.

هەنووکە جگە لە (مۆزەر) هەموو گیانلەبەرەکان ئامادەبوون. ئەو قەلەڕەشە دەساژۆیەی کە لەسەر ئەو نیشتنگایەدا[5] دەخەوت کە لە پشت دەرگاکەی دواوەدا بوو. کاتێك کە مەیجەر پەی بەوە برد کە هەر هەموو خۆیان سەقامگیرو ئاسوودە کردو بە وریاییەوە چاوەنۆڕییان دەکێشا گەرووی سافکردو تێهەڵچوو:

(هەڤالان پێشوەخت هەموو دەربارەی ئەو خەونە عاجباتیەی کەوا دوێنێ شەو بینیم خەبەردارن, بەلام من پاشان دێمە سەر خەونەکە. شتێکی دیکەم هەیە هەتا بەر لەوە بیلێم. لەو بڕوایەدا نیم هەڤالان، کە من بۆ چەندین مانگی درێژخایەنتر لەگەڵ ئێوەدا دەبم و بەر لەوەش کە بمرم هەست دەکەم کە ئەرکی سەرشانمە ژیرییەکی لەو بابەتەی کە بەدەستم هێناوە بە ئێوەی بسپێرم. ژیانێکی

---

[5]. نیشتنگا: perch: جێگای تایبەتیکراو بۆ هەڵنیشتنی باڵندە.

درێژدادرم هەبوو، وەختێکی زۆرو زەبەندیشم بۆ تێفکرین هەبوو هەر کاتێك کە بە تاقی تەنیا لە بەستنگاکەمدا[6] ڕادەکشام، لەو باوەڕەشدام کە بتوانم ئەوە بڵێم کە تەمەت هەر گیانلەبەرێك کەوا ئێستاکە بژێوی دەکات لە سروشتی زیندەنگی ئەم سەرزەمینە حاڵیم. دەربارەی ئا ئەمە بە ئارەزووم بۆ ئێوە بدوێم. کەواتە هەڤالآن[7]، سروشتی ئەم هەڵکردنەی ئێمەو مانان چیە؟ دە با بە بوێرییەوە ڕووبەڕووی بوەستین. ژیانمان مەینەتبارو دژوارو کورتەڵەی لەدایکبووینە، هەر هێندە خۆراکمان دراوەتێ کە لە جەستەماندا پشوو بهێڵێتەوەو ئەوانەشمان کە جەربەزەین دەتوانین بە ناچارکراوی هەتا دوا گەردیلەی وزەو توانامان کاربکەین و هەمان چرکەساتیش کە سوودبەخشینمان بە کۆتایی گەشت، ئەوا بە دڵڕەقییەکی دزێوەوە سەردەبڕدرێین. ئاژەڵ نیە لە ئینگلستاندا پاش ئەوەی تەمەنی بە یەك ساڵان دەگات مانای بەختەوەربوون, یاخود دەست بەتاڵبوون بدرکێنێت. ئاژەڵ نیە لە ئینگلستاندا ئازاد بێت. ژیانی ئاژەڵ چەرمەسەریو کۆیلایەتییە.. ئا ئەمەیە هەقیقەتی بیّ پەردە, بەڵام ئایا ئەمە بە سادەیی چمکێکە لە زاگوونی سروشت؟ ئایا لە سۆنگەی ئەوەوەیە کە زەمینەی ئێمە ئەمەندە نەدارە کە لە توانایدا نیە ژیانێکی لەبار بۆ ئەوانە دابین بکات کە لە سەریدا ئۆقرەگیرن؟ نەخێر، هەڤالآن، یەك هەزار جار نەخێر! خاکی ئینگلستان بە پیتو بەرەکەتە،

---

[6]. بەستنگا: Stall: جێگای بەستنەوەی ئاژەڵ لەنێو تەویلەدا.

[7]. Comrades

کلایمێتەکەشی[8] جێی پەسەندییە، لە توانایدا هەیە خۆراکێکی زۆروبۆر بۆ مەزنترین ژمارەی بێشوومارتری گیانلەبەران زامن بکات ئا لەوەی کە دەرحاڵ سەقامی تیادا دەگرن. ئەم تاقە مەزرایەی ئێمە دەتوانێت دەرزەنێك ئەسپ، بیست دانە مانگا، سەدان مەڕومالآت بگرێتە خۆیو هەمووشیان لەو ئاسوودەییو شکۆمەندیەدا بژین کە ئێستاکانە تەقریبەن لە دەرەوەی وێناکردنی ئێمەدایە, ئەی ئیتر بۆچی ئێمە ئالەم مەرجو دۆخە مەینەتاویەدا بەردەوامین؟ چونکە تەقریبەن هەموو بەروبوومی ڕەنجی ئێمە لەلایەن ئادەمیزادەوە لێمان دزراوە. ئەوەتانێ هەڤالآن، وەرام بۆ سەرجەم گێرمەو کێشەکانی ئێمە لە تاقە وشەیەکدا پوخت کراوتەوە- مرۆڤ. مرۆڤ یەکە شۆڤاری ڕاستەقینەی ئێمەیە. لە دیمەنەکەدا مرۆڤ دابڕە. ڕەگ وڕیشەی هۆکارەکانی برسێتیو کاری دژوار بۆ هەتاهەتایە لەناو دەبرێت.

مرۆڤ تاقە مەخلوقێکە کە بەبێ بەرهەمهێنان بەرخۆریی دەکات. شیر نادات، هێلکە ناکات، لەوەش زەبوونترە کە پاڵ بە گاسنەوە بنێت، توانای ئەوەشی نیە بەخێراییەکی چاك بۆ کەروێشك گرتن غار بدات، لەگەڵ ئەوەشدا سەروەری هەر هەموو ئاژەلآنە. ئاڕاستەی ئیشکردنیان دەکات، کەمترین هێندیان دەداتەوە کە لە برسێتی دەیان پارێزێتو ئەوەی دیش هەموو بۆ خۆی دەقۆزێتەوە. ڕەنجبەریی ئێمەیە، خاکەکە جووت دەکات، شیاکەی ئێمەیە بە پیتی دەکاتو هێشتاش یەکێك نیە لە ئێمە کە لە پێستە ڕەجاڵەکەی خۆی

---

8. Climate: ئاووهەوا. کەش وبا.

بترازیٚ شتێکی تری هەبێت. ئێوە ئەی مانگاکان کە لەبەردەم خۆمدا دەتان بینم، بەدرێژایی ئەم ساڵەی ڕابردوو چەند هەزار گاڵۆنە شیرتان داوە؟ و چیش بەسەر ئەو شیرەدا هات کە دەبووایە گوێرەکەی پڕ تینو تاقەت پەروەردە بکات؟ گشت دڵۆپێکی بە گەرووی خوونکارەکانی ئێمەدا داچۆڕاوەتە خوارەوە. ئێوەش ئەی مریشکەکان هەر لەم ساڵەی ڕابردوودا چەند هێلکەتان کردو چەندیش لەو هێلکانە تاکو ئێستاکیٚ بۆ بەمریشکبوون هەڵهێنراون؟ پاشماوەکەی سەرجەم ڕۆشتووەتە بازاڕ هەتا بۆ جۆنزو دارودەستەکەی (دراو) پەیدا بکات. ئەی تۆ کلۆڤەر کوانیٚ ئەو چوار جوانووەی کە زابیت؟ کە دەبووایە ببنە یاریدەدەرو کەیفوسەفای بەساڵدا چوونت؟ هەر دانەیەك بە یەك ساڵانی فرۆشرا- قەتاوقەتیش ئیدی نایان بینیتەوە. بەرابەر بەو چوار کەرەت ئاوسبوونەو هەموو ڕەنجکێشانی ناو کێڵگەت جگە لە کەمترین ئازووقەی خۆتو بەستنگاکەت بەولاوە تا بەحاڵ چیت هەبووە؟ هەتا ئەو ژیانە پڕ مەینەتییەش کە دەیگوزەرێنین ڕێی پێنەدراوە بۆئەوەی ماوەی سروشتی خۆی بخایەنێت. من بۆ خۆم پرتەوبۆڵە ناکەم، چونکە من یەکێکم لە شانسدارەکان. تەمەنم دوازدە ساڵانەو پتر لە چوارسەد بەچکەم بووە. ژیانی خواسایی بەرازێك ئاوهایە, بەڵام لە کۆتاییدا هیچ ئاژەڵێك لە چەقۆی بێبەزەیی دەربازی نابێت. ئێوەش ئەی ئەو کودەڵە بەرازە جحێڵانەی کە لەبەردەمم ڕۆنیشتوون هەریەکێك لە ئێوە لە ماوەی یەك ساڵدا لەبەردەم مێزی هەڕاجیدا قیژەو هاواری ژیانتان دەردەپەڕێنن. هەر هەمووی دەبیٚ بەو ئەرژەنگەو سامە بگەین- مانگاکان، بەرازەکان، مریشکەکان، مەڕەکان... هەر هەموو,

هەتاكو ئەسپەكانو سەگەكانیش سەرنوشتێكی چاكتریان نابێت. تۆ بۆكسەر هەر ئەو ڕۆژەی كە ئەو ماسولكە مەزنانەت هێزو تاقەتی خۆیان لەدەست دەدەن، جۆنز بە ناكەرێكت[9] دەفرۆشێت، گۆشاوگۆش گەردنت دەبڕێتو بەتەواوی بۆ تاژییە شكاریەكان دەتكولێنی. بۆ سەگەكانیش بەهەمان جۆر، كاتێك كە دەكەونە نێو ساڵەوەو كەلو بێ دان دەبن, جۆنز خشتێك بە دەوری بەسكوردیانەوە شەتەك دەداتو لە نزیكترین گۆلاودا نووقمیان دەكات. ئایا كریستاڵ ئاسا ڕۆشن نیە؟ كەوابێ هەڤاڵان كە هەموو چەپەڵكاریەكانی ئائەم ژیانەی ئێمە لە جەوروستەمی ئادەمیزادەوە هەڵدەقوولێ؟ هەر تەنها ڕزگاربوون لە مرۆڤ دەمانكاتە خاوەنی دەستكەوتی ڕەنجكێشانی خۆمان. تەقریبەن بە یەك شەو دەكرێ ڕەهاو دەوڵەمەند بین. كەواتە دەبێت چی بكەین؟ وای شەوو ڕۆژ، گیانو ڕۆح بخەینە ئیشەوە، بۆ سەرنگوونكردنی نەژادی مرۆڤ! ئا ئەمەیە بۆ ئێوە پەیامی من، هەڤاڵان: یاخیگەریی، من نازانم كەی ئەو یاخیگەرییە بەرپا دەبێت لەوانەیە لە یەك هەفتەدا، یاخود لە سەد ساڵدا بێتە دی، بەڵام بەو متمانەیەی كە پووشو پەڵاش لەژێر پێیەكانمدا بەدی دەكەم دەزانم، كە زوو یاخود درەنگ دادپەروەری بەئەنجام دەگات. هەڤاڵان لە سەرتاسەری ژیانە بۆماوە[10] كورتەكەتان چاو لەسەر ئەوە بگێرسێننەوە! لە سەرووی هەموو شتێكیشەوە ئەم پەیامەی من

---

.[9] Knacker : كڕیاری گیانلەبەرەماڵییە پەككەوتەكان، یاخود كەلاشیان دوای مردنو بەكارهێنانی وەكو خۆراك بۆ گیانلەبەری دیكە.

.[10] Comradeship .

بگەیەنن بەوانەی کە پاش خۆتان دێن، بۆئەوەی وەچەکانی ئاینده بتوانن هەتا سەرفرازی لە تێکۆشان بەردەوام بن.

لەبیریشتان نەچێت هەڤاڵان نابێ هەرگیز ورەتان شکست بخوات. نابێ هیچ ئارگومێنتێك بەرەو چەواشەیی ڕێنماییتان بکات. قەتاوقەت گوێ مەگرن لەوانەی کە پێتان دەڵێن مرۆڤ و گیانلەبەران بەرژەوەندی هاوبەشیان هەیە، ئەوەی کە دەڵێن بوژانەوەی یەکێکیان بوژانەوەی ئەوی تریانە. هەر هەموو درۆو دەلەسەن. مرۆڤ خزمەتی بەرژەوەندی هیچ زیندەوەرێك ناکات تەنها خۆی نەبێت. دەبا لە مابێنی ئێمەی گیانلەبەرانیشدا بەکەماڵترین یەکێتی، بەکەماڵترین هەڤاڵدۆستی[11] لە کێشمەکێشمەکەماندا هەبێت. مرۆڤ هەر هەموو نەیارن، گیانلەبەران هەر هەموو هەڤاڵن.

لەم چرکەساتەدا جاڕوجەنجاڵییەکی لەڕادەبەدەر پەیدابوو. کاتێك کە مەیجەر خەریکی ئاخاوتن بوو چوار جرجی گەورە لە کونەکانیانەوە بە خشکەخشك هاتنەدەرێو لەسەر پاشەڵی خۆیان دانیشتبوون گوێیان لێیگرتبوو. ناگەهان دیداریان سەرنجی سەگەکانی ڕاکشاو هەر تەنها بە بەلەزیی خۆتەپاندنە کونەکانیان بوو کە ژیانی جرجەکانی پاراست. مەیجەر بۆ هێورکردنەوە سمەکەی بەرزکردەوەو وتی:" هەڤاڵان ئەمە خاڵێکە کە دەبێ یەکاڵا بکرێتەوە. مەخلوقاتە کێویلەکان، مانەندی جرجو کەروێشکەکان- دۆستی ئێمەن, یاخود دوژمنی ئێمەن؟ با بیخەینە دەنگدانەوە. بۆ ئەم کۆبوونەوەیە پێشنیاری ئەم پرسیارە

---

[11]. Tobacco : تووتن, جگەرە.

دەکەم: ئایا جرجەکان هەڤاڵن؟" یەکسەر ڕاگیریی کراو لەلایەن زۆرینەیەکی لە ڕادەبەدەرەوە لەسەر هەڤاڵبوونی جرجەکان ڕێك کەوتبوون. هەر تەنیا چواردانە ڕای جیاواز هەبوو، سێ سەگەکەو پشیلەکە، کە دواتر دەرکەوت کە لە هەردوو لادا دەنگیان دابوو. مەیجەر درێژەی دایێ:

- نەختێکی دیکەم هەیە بۆ وتن. من هەر ئەوە دووپات دەکەمەوە، هەمیشە ئەرکی شەڕانگێزیتان بەرامبەر بە مرۆڤ و پێچوپەناکانی لەیاد بێت. (هەرچی بەسەر دوو لاقەوە دەڕوات ئەوە دوژمنە. هەرچی بەسەر چوار لاقەوە دەڕوات، یاخود باڵی هەیە، ئەوە دۆستە). ئەوەشتان لەیاد نەچێت کە لە شەڕی دژ بە مرۆڤدا نابێت بەو شەباهەت پەیدا بکەین, هەتا ئەگەر کاتێك شکستیشتان دا. نەگریسییەکانی مەگرنە خۆ. هەرگیز نابێت هیچ ئاژەڵێك لە خانوودا هەڵ بکات، یاخود لەنێو جێخەودا بنووێت، یان جلوبەرگ بپۆشێت، یاخود ئەلکهول بخواتەوە، یاخود تۆباکۆ[12] بکێشێت، یان دەست لە پارە بدات، یاخود بە بازرگانییەوە سەرقاڵ بێت، هەموو خەسڵەتەکانی مرۆڤ ئەهریمەنانەیە، لە سەرووی هەمووشیانەوە هەرگیز نابێت هیچ ئاژەڵێك بەسەر هاوڕەگەزەکەی خۆیدا زوڵم و ستەم بکات. بوودەڵە بێت یاخود بەهێز، زرنگ بێت یاخود ساویلکە، هەموومان براین. هەرگیز نابێت هیچ ئاژەڵێك هیچ ئاژەڵێکی تر بکوژێت. گیانلەبەران هەموو یەکسانن. (ئێستاش هەڤالان لەمەڕ خەونەکەی دوێنێ شەومەوە بۆتان دەدوێم. ناتوانم ئەو خەونەتان بۆ وەسپ بدەمەوە. خەونێك

---

[12]. Tobacco: تووتن, جگەرە.

بوو دەربارەی زەمین کە چۆن دەبێت کاتێك کە مرۆڤ تیایدا ڕەویووەتەوە، وەلیٚ شتێکی وەبیرهێنامەوە کە لەمێژ بوو فەرامۆشم کردبوو. چەندەها ساڵ بەر لە ئێستا ئەو عەیامەی کە بێووڵە بەرازێك بوو دایکمو ماڵۆسەکانی دیکە وەکو خوونەریت کۆنە سترانێکیان دەچڕی کە تەنها نەغمەکە[13]و سێ پەیڤی یەکەمیان دەزانی. من هەر لە زارۆڵەییمەوە ئەو ئاوازەم زانیبوو، کەچی ماوەیەکی درێژە لە ئاوەزم ئاودیوو بووە. دوێنێ شەو بەهەرحاڵ لە خەونەکەمدا هاتەوە یادم. لەوەش بەولاوە وشەکانی سترانەکەشم هاتنەوە بیر- وشەکان من دڵنیام کە لەلایەن گیانلەبەرانی دێرزەمانەوە دەچڕاو بۆ چەندەها نەوەش لە یادەوەریدا لەبیر کرابوو. ئێستاکێش ئەو گۆرانیەتان بۆ دەچڕم. هەڤاڵان من پیرم و دەنگیشم گڕو قەبەیە، بەڵام کاتێك کە ئاوازەکەم فێرکردن دەتوانن بۆ خۆتان چاکتر بیچڕن. پێی دەڵێن (گیانەوەرانی ئینگلستان). مەیجەری بەتەمەن و داکەوتوو گەرووی ساف کردو کەوتە چڕین. هەروەکو خۆی وتی دەنگی گڕو قەبە بوو، بەڵام گەلێك نایاب چڕیو ئاوازێکی هەژێنەر بوو، شتێك بوو لەمیان (کلێمەنتینە)و (لاکوکورچچا)[14]دا. وشەکانیش ئاوا ڕەوتیان دەگرت:

گیانەوەرانی ئینگلستان، گیانەوەرانی ئینگلستان
گیانەوەرانی گشت هەرێمو سەر زەمینێك
گوێ ڕادێرن بۆ مژدە شادەکانی من

[13] Tune .: نەوا، ئاواز، نەغمە.

[14] Clementine and Lacucuracha . : دوو جۆرە نەوان.

لەمەڕ ڕۆژانی هاتووی بە خشڵو زێڕین

زوو یا درەنگ ئەو ڕۆژە دێت،
کە مرۆڤی ستەمکار دەبێ لابرێ
کێڵگە سەمەر بەخسەکانی ئینگلستانیش
دەبێ تەنها گیانەوەرانی بەسەرا تێبپەڕێ
ئەڵقەکانی کەپوومان دەبێ نەمێنێو
ڕەختو تفاقی سەر پشتیشمان هەروەها،
ئاسنی لغاوو نەقیزەش دەبێ هەمیشە ژەنگ بگرن
قامچییە دلڕەقەکانیش نابێ ئیتر فیشکەیان بێت.

دارایی پتر لەوەی هزر بتوانێ وێنەی بکات
گەنمو جۆ، خرپووکو پووشو پەلاش،
سێپەرە، لۆبیاو گاچەوەنەر[15]
دەبێ ببێتە هی ئێمە لەو ڕۆژەدا
کێڵگەکانی ئینگلستان نورانی دەدرەوشێتەوە
دەبێ ئاویان پاقژو خاوێن تر بێت،
سازگارتریش هێشتا دەبێ شنەباکانی هەڵبکەن

15 . جۆرە چەوەنەرێکە وەکو خۆراك بە ئاژەڵان دەدرێت.

ئالەو ڕۆژەی کە ئێمە بەرهەڵدا دەکات

بۆ ئەو ڕۆژە ئێمە هەموو پێویستە زەحمەت بکێشین
گەرچی ئێمە بەر لە گزنگدانی دەمرین،
مانگاو ئەسپان، قازو قەلان[16]
پێویستە گشت لەپێناوی ڕەهاییدا ڕەنجبەر بن

گیانەوەرانی ئینگلستان، گیانەوەرانی ئینگلستان
گیانەوەرانی گشت هەرێمو سەرزەمینێك
گوێ ڕادێرن لە مژدە شادەکانی من
لەمەڕ ڕۆژانی هاتووی بە خشڵو زێڕین

چڕینی ئەم گۆرانیە گیانلەبەرەکانی تووڕهەڵدایە نێو کێویلەترین هەیەجانو خرۆشەوە. تەقریبەن پێش ئەوەی مەیجەر بگاتە کۆتایی بۆ خۆیان دەستیان کردبوو بە چڕینی, هەتاکو گەمژەترینیشیان پێشوەخت ئاوازەکەو هەندێك لە وشەکانی قۆزتبۆوەو بەهەمان شێوە بۆ زیرەکئاساکانی مانەندی بەرازەکانو سەگەکانیش، سەرپاکی گۆرانییەکەیان لە چەند خولەکێکدا ئەزبەر کرد. ئەوساش پاش هەندێك مەشقی دەستپێکی سەرانسەری مەزراکە لەناکاو بە هەماهەنگیەکی

16 . عەلەشیش. قەلەموون.

سەرسورهێنەرەوە بە (گیانەوەرانی ئینگلستان) تێی هەڵچوون. مانگاکان کردیانە بۆڕەبۆڕ، سەگەکان کردیان بە وەڕین، مەڕەکان کردیان بە باڕەباڕ، ئەسپەکان دەستیان کرد بە حیلەحیل، مراوییەکان کردیان بە کوواکە کوواک[17] بە گۆرانییەکە ئەمەندە کامڕەوا بوون کە پێنج جار دوابەدوای یەك سەرتاسەری وتیانەوەو ڕەنگە سەرومڕ بەدرێژایی شەو بیان چڕیبایە گەر بهاتباو لێیان تێکنەدرابایە؟ ئەفسوس کە جاڕوجەنجاڵەکە مستەر جۆنزی وەخەبەر هێنابوو، کە دەرپەڕیبووە دەرەوەی پێخەفەکەوە هەتا ساخی بکاتەوە داخۆ ڕێوی لەناو حەوشەکەدا بوو. پڕی بە تفەنگەکەیدا کرد کە هەردەم لە سیلەیەکی ژووری نووستنەکەیدا هەڵپەساردرابوو، شەش کەڕەت هێنایەوەو سێرەی گرتەوەو بەنێو تاریکییەکەدا تەقاندی, فیشەکەکان خۆیان لەنێو تەویلەکەدا ناشتەو کۆبوونەوەکەش بە پەلەپروزێ دوایی پێ هێنرا.

هەریەکەو بەرەو جێگا- خەوی خۆی هەڵات. باڵندەکان بۆ نیشتنگاکەی خۆیان هەڵفڕوونان، ئاژەڵەکان لەنێو پووشو پەڵاشەکەدا سرەوتیان گرتو سەرجەم مەزراکەش لە چرکەساتێکدا خەوبردیەوە.

---

[17]. Quack : دەنگی مراوی.

# بەشی دووەم

سێ شەو دواتر پیرە مەیجەر بە ئاسوودەیی لە بۆتەی خەودا مرد. لاشەکەی لە پایینی باخەکەدا بە خاك سپێردرا. ئەمە لە سەرەتای مانگی ئازاردا بوو. لەمیانەی ئەو سێ مانگەی دواتردا گەلێك چالاکی نهێنی لە ئارادا بوو. گوتارەکەی مەیجەر بەتەواوەتی گۆشەنیگاو دیدێکی تازەی لەسەر ژیان بە گیانەوەرە هۆشمەندترەکانی سەر مەزراکە بەخشی. نەیاندەزانی ئەو یاخیگەرییەی کە لەلایەن مەیجەرەوە پێشبینی کرابوو کەینێ ڕوودەدات؟! هیچ بەڵگەیەکیشیان بەدەستەوە نەبوو بۆ تێفکرین لەوەی کە هەر لەو ماوەیەی ژیانی خۆیاندا دەبێت، وەلێ بە ڕوونو ئاشکرایی پەییان بەوە بردبوو کە ئەرکی ئەوان خۆیان بوو کە ئامادەکاریی بۆ بکەن. کاری فێرکردنو ڕێکخستنی ئەوانی دیکە بێگومان کەوتە ئەستۆی بەرازەکان، کە بەگشتی بەوە ناسرابوون کە زیرەکترینی

گیانلەبەرەکانن. لەمیانی بەرازەکاندا دوو یەکانەی[18] جحێڵو لێهاتوو هەبوون بەناوی سنۆبۆڵو ناپولیۆنەوە[19] کە مستەر جۆنز بۆ فرۆشتن پەروەردەو بەخێوی دەکردن. ناپولیۆن یەکانەیەکی زلحۆرتی، ئەوی ڕاستی بێ سەروسیما- ترسناکی بێرکشایەر[20]بوو، تاقە بێرکشایەری سەر مەزراکە بوو، قسەبێژێکی زۆربلێ نەبوو، بەڵام بۆ بەدیهێنانی خواستەکانی خۆی شۆرەتدار بوو. سنۆبۆڵیش بەرازێکی لە ناپولیۆن سەرزەیندەتر بوو، لە دووانیشدا گوڕترو داهێنەرتر بوو، کەچی وا لە قەڵەم نەدەدرا کە هەمان قووڵایی هەبێت لە کاراکتەرییدا. هەموو بەرازە نێرینەکانی دیکەی سەر مەزراکە کوودەڵە بوون. لەنێوانی ئەوانەشدا باشترین بەرازی شوناس بەرازێکی خرپۆڵەی بچکۆلانە بوو بەناوی (سکویلەر)[21]ەوە کە جووتێ ڕوومەتی زۆر خڕو دوو چاوانی بە ترووکە ترووك و جموجۆڵی چووستو چالاك و دەنگێکی تیژی هەبوو. داخێوەرێکی بەسەلیقەش بوو، کاتێك کە مشتومڕی لەبارەی هەندێك خاڵی دژوارەوە دەکرد. خوویەکی وای هەبوو کە لەملاوە بۆ ئەولا قەڵەمبازی دەداو کلکی دەلەقاند کە بەجۆرێك لە جۆرەکان گەلێك قایلکەرانە بوو. ئەوانی دی دەربارەی سکویلەر ئەوەیان دەوت کە لە توانایدایە ڕەش بکات بە سپی.

---

18. Boor: یەکانە، بەرازی نێر
19. Snowball and Napoleon: سنۆبۆڵو ناپولیۆن.
20. Berkshire.
21. Squealer.

ئەم سێ دانەیە ئامۆژگارییەکانی پیرە مەیجەریان دەوڵەمەندتر کردو خستیانە نێو سیستەمێکی کامڵی فیکرەوە، کە ناوی (ئاژەڵێزم)[22] یان پێبەخشی. چەندین شەوی هەفتە پاش نووستنی مستەر جۆنز لەنێو تەویلەکەدا کۆبوونەوەی نهێنیان دەبەستو پرنسیپەکانی ئاژەڵێزمیان بۆ ئەوانی دیکە ڕاڤە دەکردەوە. لە سەرەتادا زۆر بە گەمژانەو بێ دەربەستانە گرد دەبوونەوە. هەندێك لە گیانلەبەرەکان لەبارەی ئەرکی وەفاداربوون بەرامبەر بە مستەر جۆنز دەدوان، کە بە (ئەرباب)[23] ئاماژەیان بۆ دەکرد، یاخود تێبینی بنەڕەتیو گەوهەرییان پێشنیار دەکرد لە وێنەی مستەر جۆنز بەخێومان دەکات. ئەگەر ئەو بڕوات، ئەوا لە برساندا دەمرین. ئەوانەی تر پرسیاری ئاوایان دەپرسی: بۆچی بایەخ بەوە بدەین کە دوای مردنی ئێمە چی ڕوودەدات؟ یاخود ئەگەر ئەم باخیگەرییە بەهەرحاڵ ڕوودات چ جیاوازییەك بەرپا دەکات ئەگەر ئێمە ئیشی بۆ بکەین یان نا؟ بەرازەکانیش گیروگازی مەزنیان هەبوو لەوەی کە وایان لێبکەن بەوە پەی بەرن کە ئائەمە هاودژی ڕۆحییەتی ئاژەڵێزمە. لەنێو هەموو پرسیارەکاندا کەودەنترینیان ئەوەبوو کە لەلایەن مۆڵی[24] مایینە سپیەوە پرسرا, بەتایبەتی یەکەمین پرسیاری کە لە سنۆبۆڵی کرد: (ئایا پاش یاخیگەرییەکەش هێشتاکە هەر شەکر دەبێت؟). (نەخێر) سنۆبۆڵ بە ڕەقییەکەوە وتی: "دەستاوێژەکانی دروستکردنی شەکرمان

---

22 . Animalism . ئاژەڵگەرایی.

23 . Master . سەروەر، ئەرباب.

24 . Mollie.

نیە لەم مەزرایەدا, لەگەڵ ئەوەشدا پێداویستیمان بە شەکر نیە. هەرچی چەنێك خرپووكو پووشو پەلاشت گەرەك بێت دەتبێت". ئەی هێشتاش رێگەم پێدەدرێت بە پالّمەوە شریتەکان[25] بپۆشم؟ مۆڵی پرسی. هەڤاڵ سنۆبۆڵێش وتی: "ئائەو شریتانەی کە تۆ ئەمەندە پێیانەوە پابەندیت نیشانەی بەندایەتین. ئایا ناتوانیت لەوە حاڵی بیت کە ئازادی لەو شریتانە زیاتری شایانە؟" مۆڵی بەوە رازی بوو، بەڵام وێنەدەچوو کە دروست قایل بووبێت.

بەرازەکان هەتا تێکۆشانێکی سەختتریشیان لەبەردەمدا هەبوو بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەو درۆودەلەسانەی کە لەلایەن قەلەڕەشی دەساژۆو مۆزەرەوە لە ملاو لەولادا ڕادەگەیەنران. مۆزەر کە گیانەوەری دەستەمۆی تایبەتمەندی مستەر جۆنز بوو، سیخوڕو بڵاوکەرەوەی پڕوپاگەندە بوو، وەلێ وتەبێژێکی بەهزریش بوو. ڕایگەیاند کە زانیاری دەربارەی ئێگزیستی وڵاتێکی نهێنی ئامێز هەیە پێی دەڵێن (کێوی نەبات)[26] کە سەراپای گیانلەبەران کاتێك کە مردن بۆ ئەوێ دەچن. لە شوێنێکی بەرزی ئاسماندا جێگیرە، تۆزقاڵە مەودایەك لەودیوو گەواڵەکانەوەیە. مۆزەر وتی: "لە کێوی نەباتدا حەوت ڕۆژی هەفتە یەکشەممە بوو، بەدرێژایی ساڵ وادەو مەوسمی سێپەرەو کلۆشەکر بوو، لینسیدکەیك[27]ش

[25]. Ribbons : شریت، قەیتان، قردێلە.

[26]. Suger Candy Mountain.

[27]. Linseed Cake :

لەسەر هێجەکاندا[28] دەڕوا." گیانلەبەرەکان قینیان لە مۆزەر بوو, چونکە درۆودەلەسەی بڵاودەکردەوەو هیچ کارێکی ئەنجام نەدەدا، بەڵام هەندێك لەوانە باوەڕیان بە کێوی نەبات کردبوو، بەرازەکانیش بۆ قایلکردنیان بەوەی کە جێگای لەو بابەتە نیە، دەبووایە فرە بە سەختی دەمەتەقێ بکەن. بە ئەمەکترین موریدەکانیان هەردوو ئەسپانی- گالیسکەکە بوون، بۆکسەرو کلۆڤەر. ئەم دووانە بۆ خۆیان لەوەبەرهێنانی تێفکرینی هەر جۆرێکدا دژوارییەکی بزورگیان هەبوو، بەڵام کە جارێك بەرازەکانیان بە مامۆستای خۆیان قبووڵ کرد هەموو ئەو شتانەیان هەڵمشت کە پێیان وتراو لە ڕێگای وتووێژی سادەو ساکارەوە بە ئاژەڵەکانی تریان گەیاند. لە حازربوونیان لە کۆبوونەوە نهێنییەکانی نێو تەویلەکەدا نووشوستیان نەدەهێناو ڕابەرێتی چڕینی (گیانەوەرانی ئینگلستان)یان دەکرد کە هەردەم بەوە کۆبوونەوەکان کۆتاییان پێدەهات.

کەواتە: هەروەکو دەرکەوت یاخیگەرییەکە گەلێك پێش وەختتر بەئەنجام گەشتەو زۆر ئاسانتر لەوەی کە هیچ کەسێك چاوەنۆڕی کردبێت لە ساڵانی تێپەڕیوودا. مستەر جۆنز سەرباری ئەوەی کە ئەربابێکی سەخت بوو، مەزراگەرێکی[29] جەربەزەش بوو، بەڵام بەم دواییە بەسەر ڕۆژگارە شوومەکاندا کەوتبوو. پاش دۆڕاندنی پارە لە کێشەیەکی دادگاییو یاساییدا گەلێك نائومێد ببوو. خواردنەوەی گەلێك پتر لەوەی گرتبووەخۆ کە بۆی لەبار بوو. جاروبار بۆ

---

[28]. Hedge : بەرژینو چەپەرێك کە لە لێرو گژوگیا, یاخود دڕكو دەوەن دروست کرابێ.

[29]. Farmer : خاوەن مەزرا، وەرزێر.

چەندین ڕۆژی ڕەبەق لە موبەقەکەدا لەنێو کورسییە ویندسەرەکەی[30]دا دادەنیشتو تەوەزەلی دەکرد، ڕۆژنامەی دەخوێندەوە، دەیخواردەوەو بە بۆنەو جاروبار وردکەنانی وشکی خووسێنراوی نێو بیرەی دەرخواردی مۆزەر دەدا. داروودەستەکەی تەمەڵو ناڕاستگۆ بوون، کێڵگەکان ژاوە بوون لە گژوگیای زیانبەخش، باڵەخانەکان ئاتاجیان بە سەبانە هەبوو، هێجەکان پشتگوێ خرابوونو ئاژەڵەکانیش تێروتەسەل خواردنیان نەدەدرایە.

مانگی گوڵان هاتو پووشو پەلاشەکە تەقریبەن ئامادەی بڕینەوە بوو. لە ئێوارەی نێوەندی هاویندا[31] کە ڕۆژی شەممە بوو مستەر جۆنز ڕۆشتە ویلینگدۆنو لە ڕێدلایەندا[32] ئەمەندە سەرمەستو مڕ بوو هەتا نیوەڕۆی یەکشەممە نەگەڕایەوە ماڵێ. پیاوەکان بەیانی زۆر زوو مانگاکانیان دۆشیو ئینجا بۆ کەروێشك گرتن وەدەرکەوتن، بەبێ ئەوەی خۆیان بە دەرخواردانی ئاژەڵەکانەوە تەنگەتاو بکەن. کاتێك کە مستەر جۆنز هاتەوە کتوپڕ چوو لەسەر قەنەفەی ژووری میوانەکەدا بخەوێتو هەواڵەکانی جیهان[33] بەسەر دەموچاویەوە بێت، کە ئێوارەش داهات ئاژەڵەکان هێشتا هەر خۆراکیان پێنەدرابوو. سەرەنجام ئیتر نەیاندەتوانی زیاتر

---

Windsorchair . [30] : جۆرە کورسیەکە لە دارو تەختە سازێنرابێ.

[31] . Midsummer.

[32] . Red lion.

News of the World . [33] : ڕۆژنامەی هەواڵەکانی جیهان.

بەرگە بگرن. یەکێك لە مانگاکان بە قۆچی دەرگای عەمارخانەکەی[34] شکاندو هەموو ئاژەڵەکانیش لە ڕێی سنووقەکانەوە کەوتنە یارمەتیدان. ئائەو دەمە بوو کە مستەر جۆنز ئیدی وەئاگا هاتبوو. چرکەساتی دواتر خۆیو هەر چوار داروودەستەکەی بە قامچیەکانی دەستیانەوە لە عەمارخانەکە بوونو بە هەموو ئاراستەیەکدا دایان دەوەشاند. ئەمە لەوە زیاتر کە ئاژەڵە برسییەکان بتوانن بەرگەی بگرن. بە هاوتەباییەکەوە کە هیچ شتێکی لەو بابەتە پێشتر پلانی بۆ دانەنرابوون خۆیان هەڵدایە سەر ئەشکەنجەدەرەکانیان. لەناکاو جۆنزو پیاوەکانی پەیان بەوە برد کە لە هەموو لایەکەوە قۆچو لەقەیان تێوە دەژەنرێت. بارودۆخەکە بەتەواوەتی لەژێر قەڵەمڕەوی ئەوان دەرچووبوو, پێشتر هەرگیز نەیانبینیبوو ئاژەڵان بەو تەرزە ڕەفتار بکەنو ئەم ڕاپەڕینە ناکاوەش کە ئەو مەخلوقاتانەی کەمو زۆر خۆیان هەڵیان بژاردبوو خوو بە جەڵدەکارىو جەورو ستەمەوە بگرن، وایان زنۆق بردن خەریکبوو لە هۆش خۆ بچن. هەر تەنها پاش ساتێك, یاخود دووان لە هەوڵو تەقەلای بەرگریکردن لە خۆ دەستیان کێشایەوەو کەوتنە سەر پاژنەو هەڵاتن. خولەکێك دواتر هەر پێنجیان لە ڕاکردنێکی تەواودا بوون بە خوار ئەو ڕێگا گالیسکەییەی کە دەچووەوە سەر ڕێگا گشتیەکەو ئاژەڵەکانیش بە شانازییەوە پەیگریان دەکردن.

---

Storeshed . [34] : کەپرۆکەیەك کە لە تەختەو دار بنیات دەنرێو شمەکی زیادەو خۆراکی تیادا هەڵدەگیرێت.

مسس جۆنز لە پەنجەرەی ژووری نووستنەکەوە تەماشای دەرەوەی دەکرد، بینی کە چی ڕوویدەدا، چنگ لەسەرشان چەند سمەك‌و پێداویستییەکی توڕدایە نێو خورجێنێکەوەو لە ڕێگایەکی جیاوازدا لە مەزراکەوە ئاودیوو بووە دەرێ. مۆزەر لەسەر نیشتنگاکەی خۆیەوە پەڕی‌و بە شەققەی باڵ بەدویدا چوو، بە دەنگی بەرزیش دەیقیڕاند، لە هەمان کاتدا ئاژەڵەکان هەتا دەرەوە بۆ سەر ڕێگاکە ڕاوەدووی جۆنزو پیاوەکانی کەوتن‌و دەروازە پێنج- شیشیەکەیان بەدوای خۆیاندا خڕ داخست. ئەئاواش تەقریبەن بەر لەوەی بزانن چیبوو ڕویدەدا یاخیگەرییەکە بە سەرکەوتوویی پیادە کرابوو، جۆنز وەدەرخرا بوو، مەزرای مانەریش[35] هینی ئەوان بوو. بۆ چەند چرکەیەك سەرەتا ئاژەڵەکان بەزەحمەت توانیان باوەڕ بە خۆششانسی خۆیان بکەن. هەوەڵێن کرداریان ئەوە بوو کە بەبێ سێ و دووکردن بە دەستەجەمعی بە دەوروبەری تخووبی مەزراکەدا لە چوار ناڵە بدەن، وەکو ئەوەی کە بیانەوێ بەتەواوی ئەرخەیان بن کە لەسەر هیچ شوێنێکدا ئادەمیزاد خۆی مەلاس نەداوە. ئەوسا بەغار بەرەو خانووبەرەی مەزراکە گەڕانەوە، هەتاکو دوا ئاسەواری حوکمڕانییە نەفرەتئەنگێزەکەی جۆنز نابووت بکەن -ژووری- ڕەخت و تفاق کە لە دواوەی ئاخوڕەکانەوە بوو شکێنراو لەسەرپشت بوو، ئاسنەکانی لغاو، ئەڵقەکانی لووت، زنجیری سەگەکان، ئەو کاردە بێ بەزەییانەی کە مستەر جۆنز بۆ خێسەکردنی بەرازو بەرخەکان بەکاری هێنابوون، تەواویان توڕهەڵدرانە بنی بیرەکەوە. ڕکێفەکان، ڕەشمەکان،

---

[35] .Manor Farm

چاوبەستەکان، توورەکە ئابڕووبەرەکانی ئالیك، قامچییەکانیش هەروەها سەرتاپا فڕێدرانە سەر ئاگری ئەو سەرەنوێڵکەی کە لەنێو حەوشەکەدا دەسووتا. هەموو ئاژەڵەکان کە بینیان قامچییەکانیش وا لە بۆتەی مەشقەڵانەکەدا قرچەقرچیان بە خۆشحاڵییەوە کەوتنە هەڵبەزودابەز. سنۆبۆڵیش ئەو شریتانەی هاویشتە دەروونی ئاگرەکەوە کە عادەتەن لە ڕۆژانی بازاڕو ئالوویردا باڵو کلکی ئەسپەکانی پێ ڕازێنرابۆوە.

(شریتەکان) سنۆبۆڵ وتی: "دەبێ بە پۆشاك لە قەڵەم بدرێن، چونکە سیمبولی ئادەمیزادن. هەموو ئاژەڵەکان پێویستە ڕووتو قووت بن".

کاتێك کە بۆکسەر گوێبیستی ئەمە بوو ئەو کڵاوە حەسیرییە بچکۆلەیەی کە هاوینان لەسەری دەنا هەتا مێشو مەگەزان لە گوێچکەکانی دووربخاتەوە، هێنای و لەگەڵ شتەکانی تردا هاویشتیە نێو ئاگرەکەوە.

لە ماوەیەکی زۆر کەمدا ئاژەڵەکان هەموو ئەو شتانەیان ڕامالی کە مستەر جۆنزی وەبیر دەهێنانەوە. ئەوسا ناپولیۆن دووبارە بەرەو عەمارخانەکە بردیانییەوەو دوو قات ئازووخەی[36] دانەوێڵەی بەهەر یەکێکیان داو بە هەر سەگێکیش سەرو دوو پسکیتی دا. دواسا (گیانەوەرانی ئینگلستان)یان لەم سەرەوە بۆ ئەو سەر حەوت کەڕەت بەبێ وەستان چڕییەوەو پاش ئەوەش بۆ ئەو شەوە دامرکانەوەو خەویان لێکەوت وەکو ئەوەی پێشتر هەرگیز خەویان لێنەکەوتبێ، بەڵام دەمی سپێدە وەکو ڕاهاتن ڕابوونو لە هیکرا ئەو شتە

---

.[36] . Ration

شکۆداره کەوتەوه بیریان کە ڕوویدابوو، گشتیان پێکرا بەرەو نێو بژوێنەکە غاریان دایە دەرەوه. تۆزێك خوارتر لەولای پاوانەکەوه تەپۆلکەیەك هەبوو کە بەسەر بەشێکی فراوانی مەزراکەدا دەیڕوانیو باڵادەست بوو. ئاژەڵەکان بەخێرایی چوونە سەر تەپپەکەیی‌و لە ڕۆشنایی ساف‌و شەفافی بەیانییەکەدا بە زێواری خۆیاندا کەوتنە ڕوانین. بەڵێ هینی خۆیان بوو- هەموو شتێك کە دەیانبینی هینی خۆیان بوو! لە مەستی‌و نەشئەی ئەو تێفرینەدا دڵخۆشانە هەڵدەبەزینەوەو دەخوولانەوەو دەخوولانەوە بە دەوروبەردا. لە وروژاویدا بە بازدان و خۆهەڵدانی مەزنەوە خۆیان هەڵدەدایە حەواوە. لە ئاونگدا خۆیان دەگەوزاند، پڕ بەدەم گیای بەلەزەتی هاوینیان سەرقرت دەکرد، شەقیان لە تۆپەڵە گڵی زەوییە ڕەشەکە هەڵدەداو بەرامە دەوڵەمەندەکەیان هەڵدەمژی، ئینجا گەشتێکی پشکنینان بە سەرانسەری مەزراکەدا کردو بە سەرسامییەکی لاڵ‌و پاڵەوه زەوییە کێڵڕاوەکە، کێڵگای پووش‌و پەلاشەکە، باخەکە، گۆماوەکەو دەوەنگاکەشیان هەڵسەنگاند. بەو شێوەیە بوو کە وەکو بڵێی قەتاوقەت ئەو شتانەیان بەر لەوسا نەدیتبێت‌و هەتا هەنووکەش زۆر بە سەختی باوەڕیان بەوە دەکرد کە هەر هەموو هینی خۆیان بوو.

دواسا بە ڕیز گەڕانەوە بۆ خانووبەرەی مەزراکەو لەبەردەم دەرگای تالاری مەزراکەدا بە بێدەنگی ڕاوەستان. ئەوەش هەروا هینی خۆیان بوو، بەڵام لە چوونەژوورەوە تۆقیبوون. پاش ماوەیەك، بەهەرحاڵ سنۆبۆڵ‌و ناپولیۆن سەروپۆتەلاکی خۆیان لە دەرگاکە داو بە شان‌و شەپیلکیان ئاوەڵایان کردەوەو

ئاژەڵەکانیش لە تاقە سەرەیەکدا وەژوورکەوتن، لە ترسی پەشێواندنی هەر شتێك بەوپەڕی بایەخ و ئاگاوە هەنگاویان هەڵدەنا. لەسەر نووکی پێ لە ژوورێکەوە بۆ ژوورێك ڕۆشتن، لەوە سڵکردوو بوون کە لە سەرووی سرتەشەوە باخێون و بە جۆرە هەیبەتێکەوە لەو خۆشگوزەرانیە لە باوەڕپەدەرە لە پێخەفەکان بە دۆشەکی پەڕیانەوە، لە نەینۆکەکان، لە قەنەفە هۆرسهەیرەکە[37]، لە مافووری براسلزیی[38] لە لیتۆگرافی[39] شاژنە ڤیکتۆریای سەر ڕەفی ئاگردانی ژووری- میوانەکە ئەبڵەق مابوون. خەریکبوو لە پلیکانەکەوە دەهاتنە خوارێ کاتێك کە پەی بە دیارنەمانی مۆڵی برا. کە گەڕانەوە ئەوانی دی پەیان بەوە برد کە لەدواوە لە باشترین ژوورەخەودا بەجێمابوو. پارچەیەك شریتی شینباوی لە مێز- توالێتەکەی مسس جۆنزدا قۆزتبۆوەو هەمبەر بە شانی خۆی ڕایگرتبوو. خۆی بەشێوەیەکی گەلێك گەلۆرانە لە ئاوێنەکەدا بە پەسندییەوە دەبینی. ئەوانەی تر بە توندوتیژی سەرزەنشتیان کردو چوونە دەرەوە. هەندێك هام[40] لە چێشتخانەکەدا هەڵواسرابوو بۆ گۆڕەوشاردان برایە دەرێ و بۆشکە بیرەکەی نێو سکەلەرییەکەش بە جووتکەیەکی سمی بۆکسەر شکێنرا، بێجگە لەمە هیچ شتێکی دیکە لە خانووەکەدا دەستکاری نەکرا. دەستبەجێ قەرارێکی هاوبەش وەرگیرا کە دەبێ

37. Horsehair : مووی یاڵ و کلکی ئەسپ بەکارهێنرابێت لە پڕکردنی قەنەفەو دۆشەك و شتی تر.

38. Brussel : شتێك کە ساختەی براسلزی پایتەختی (بەلژیك) بێت.

39. Lithograph : چاپکراو بەشێوەی چاپی بەردین.

40. Ham : گۆشتی لاڕانی بەراز.

خانووی نێو مەزراکە[41]چەشنی مۆزەخانەیەك بپارێزرێت. تێکڕاش بەوە قایلبوون کە هیچ ئاژەڵێك نابێت هەرگیز لەوێدا ژیان بەرێتەسەر.

گیانەوەرەکان فراڤینی خۆیان کردو دواسا جارێکی تر سنۆبۆڵو ناپولیۆن پێکەوە بانگیان کردنەوە. هەڤاڵان، سنۆبۆڵ وتی: "ئەوە سەعات شەش‌و نیوەو ڕۆژێکی دووورودرێژمان لەبەردەمدایە. ئەمڕۆ دەستدەکەین بە دروێنەی پووش‌و پەلاش. وەلیٚ گیروگرفتێکی تر هەیە کە پێویستە پێشوەخت بایەخی پێبدرێت".

بەرازەکان لەو ئانوساتەدا ئاشکرایان کرد کە لەمیانەی سیٚ مانگی ڕابردوودا لە ڕێگای کتێبێکی دێرینەی هیجاکردنەوە[42] کە تایبەت بوو بە منداڵەکانی مستەر جۆنزو تووڕدرابووە سەر کەڵەکەی گووفەکەوە خۆیان فێری خوێندنەوەو نووسین کردبوو، ناپولیۆن ناردی بە دووی قوتووە بۆیاخی ڕەش‌و سپیداو ڕووەو ئەو دەروازە پێنج- شیشەی کە دەیڕوانیە سەر ڕێگا سەرەکیەکە ملی ڕێیەکەی گرتەبەر. ئەوسا سنۆبۆڵ (لەبەرئەوەی کە سنۆبۆڵ کارامەترین بوو لە نووسیندا) لەمیان هەردوو گرێی سمەکەی خۆیدا فڵچەیەکی گرت، لەسەر شیشی سەرەوەی دەروازەکەدا بۆیەی دا بەسەر مەزرای مانەرداو لە جێگاکەی ئەودا مەزرای ئاژەڵانی ڕنووس کرد. لە ئێستا بەدواوە ئیدی ئەمە دەبووە ناوی مەزراکە. دوای ئەوە بۆ خانووبەرەی مەزراکە گەڕانەوەو لەوێدا سنۆبۆڵو ناپولیۆن ناردیان بە دووی نێردەوانێکدا کە دەیانویست ڕێك لەسەر دوا دیواری تەویلە گەورەکە

---

. 41 . Farm house

. [42] Spelling : هیجاکردن. حینجەکردن.

دابنرێت. ئەوەیان ڕوون کردەوە کە بە مووتالآو لێکۆڵینەوەکانی سێ مانگی ڕابردوو بەرازەکان سەرکەوتن لە کەمکردنەوەی پرەنسیپەکانی ئاژەڵیزم بۆ حەوت ڕاسپاردە[43]. ئەم حەوت ڕاسپاردەیەش ئێستا لەسەر دیوارەکەدا ڕنووس دەکرێن، یاسایەکی شێلگیر بەرپا دەکەن کە پێ بە پێ ئەوە دەبێ تێکڕای ئاژەڵەکانی سەر مەزرای ئاژەڵان هەتاهەتایە بژین. بە هەندێ نارەحەتییەوە (چونکە بۆ بەرازەکە سانا نەبوو کە لەسەر پەیژەکەدا پارسەنگی خۆی ڕابگرێت). سنۆبۆڵ بۆ کارکردن هەڵژنایە سەرێو سکویلەریش چەند دانە پایەیەك لە خوارەوەدا قوتووە بۆیاخەکەی بۆ هەڵگرتبوو. ڕاسپاردەکان لەسەر دیوارە ئەسفەڵت لێدراوەکەدا بە پیتی زەبەلاحی سپی نووسرانەوە کە لە دووری سی یاردەوە دەخوێنرانەوە.

ئاوا پەیاپەییان بە خۆوە دەگرت..

حەوت ڕاسپاردەکان:

1- هەرچییەك لەسەر دوو لاق بڕوات ئەوە دوژمنە.

2- هەرچییەك لەسەر چوار لاق بڕوات، یاخود باڵدار بێت ئەوە هاوڕێیە.

3- هیچ ئاژەڵێك نابێ جلوبەرگ بپۆشێت.

4- هیچ ئاژەڵێك نابێ لەنێو پێخەفدا بنوێت.

5- هیچ ئاژەڵێك نابێ ئەلکهول بخواتەوە.

6- هیچ ئاژەڵێك نابێ هیچ ئاژەڵێکی تر بکوژێت.

7- ئاژەڵان هەموو یەکسانن.

---

[43] Commandments : ڕاسپاردە، وەسایا.

زۆر وردەکارانە نووسرابوونەوە، بێجگە لەوە نەبێ کە (هاورێ)بە (هاورێ) نووسرابۆوەو یەکێك لە (س)ەکانیش[45] پشت و ڕوو ئاوەژوو هەڵگەڕابوونەوە، هیجاکان سەرلەبەر ڕاستەو دروست بوون. سنۆبۆڵ بۆ هوودەی[46] هەمووانی تر بە دەنگی گڕو قەبە خوێندیەوە. سەرجەمی ئاژەڵەکان بە ڕەزامەندییەکی تەواوەوە سەریان لە قاندو ژیرترینیان دەماودەم دەستیان کرد بە ئەزبەرکردنی ڕاسپاردەکان.

(کەوابێ هەڤالان) سنۆبۆڵ لەگەڵ تووڕدانە خوارەوەی فڵچەی بۆیەکەدا شیتاندی (بەرەو کێڵگەی پووشو پەڵاشەکە! دەبا فرە خێراتر لەوەی کە جۆنزو پیاوەکانی دەیانکرد دروێنەکردنەکە بکەین بە مەسەلەی شەرەف[47] بۆ خۆمان).

بەڵام لەم کاتەدا سێ مانگ، کە بۆ ماوەیەك گوزەری کردو بێ حەجمان دیاربوون، بە دەنگی بەرز کەوتنە بۆڕاندن, چونکە بیستو چوار سەعات بوو بێرنەکرابوونو گوانەکانیان خەریکبوو دەتەقییەوە. پاش تێفکرینێکی کەمخایەن بەرازەکان ناردیان بۆ سەتڵو بە سەرکەوتنێکی لواوەوە مانگاکانیان دۆشی، سمەکانیان زۆر بە چاکی شیاوی گرتنەخۆی ئەم وەزیفەیە بوون. بە زوویی پێنج سەتڵ شیری کەفچەڕی توێژدار هاتە ئارا کە زۆربەی ئاژەڵەکان بە مەیلێکی بەرفراوانەوە تێیان ڕووانی. (ئەو هەموو شیرە چی بەسەردا دێت؟) یەکێك وتی:

---

. Friend : هەڵە نووسراوەکەش a Friend.

. S بە ئاوەژوویی نووسرا واتە S.

. هوودە: کەڵك، سوود.

. Point of honor : ئەنجامدانی ئەرکێك کە ببێتە شانازیکردن نەك ببێتە هۆی بەجێهێشتنی کاریگەریی لەسەر ئابڕوو, یاخود ویژدان.

"جۆنز هەندێکجار بەشێکی تێکەڵ بە هارڕاوەکەی[48] ئێمە دەکرد." یەکێك لە مریشکەکان وتی: "لێگەڕێن مەراقی شیرەکەتان نەبێ هەڤالان!". ناپولیۆن شیتاندیو لەبەردەم سەتڵەکاندا جێگای بۆ خۆی کردەوە. "ئەوە خەمی بۆ دەخورێت دروێنەکە زۆر گرنگترە. هەڤاڵ سنۆبۆڵ ڕێنیشاندەر دەبێت. منیش لە چەند خولەکێکی تردا بەدواتانەوە دەبم. بەرەو پێشەوە هەڤالان! پووش‌و پەلاشەکە چاوەڕوانە".

ئابەم شێوەیە ئاژەڵەکان بەرەو خوار بۆ کێڵگەی پووش‌و پەلاشەکە گروپیان بەست هەتا دەست بە دروێنە بکەن‌و کاتێکیش ئێوارە وەختەکە گەڕانەوە تێبینی ئەوە کرا کە ئیدی شیرەکە دیار نەمابوو.

48. Mash : هارڕاوەی دانەوێڵەی لە ئاودا خووساو.

# بەشی سێیەم

چۆن زەحمەتیان کێشاو ئارەقەیان داچۆڕاند هەتا پووش‌و پەلاشەکە کۆبکەنەوە! وەلێ کۆششەکانیان پاداشتی پێبەخشرا، چونکە دروێنەکردنەکە سەرکەوتنێکی لەوەش گەورەتر بوو کە ئومێدیان بۆ خواستبوو. جاروبار ئیشوکار سەخت بوو، ئامڕازەکان بۆ ئادەمیزاد دروست کرابوون نەك بۆ ئاژەڵان‌و تەگەرەیەکی مەزن بوو کە هیچ ئاژەڵێکی گیرۆدەی ڕاوەستان بەسەر قاچە دواییینەکانیەوە توانای بەکاربردنی هیچ ئامڕازێکی نەبوو, بەڵام بەرازەکان هێند بەزەین بوون دەیانتوانی بیر لە ڕێگاچارەیەکی دیکەی هەموو دژوارییەك بکەنەوە، کەچی لەبارەی ئەسپەکانیشەوە هەموو ئینجێکی کێڵگەکە شارەزابوون‌و لەڕاستیشدا هێندە ئاشنای کارو پیشەی درەوکردن‌و گردکردنەوەی پووش‌و پەلاش بوون گەلێك چێتر لەوەی کە جۆنزو پیاوەکانی هەرگیز کردبێتیان. لە هەقیقەتدا بەرازەکان ئیشوکاریان نەدەکرد، بەڵام ڕێنمایی‌و سەرپەرشتی ئەوانی تریان دەکرد. بەو زانیارییە سەر

ئاسایەی خۆیانەوە دەبووایە خواسایی بێت کە سەرکردایەتی بگرنە ئەستۆی خۆیان. بۆکسەرو کلۆڤەر بۆ دەزگای برین یاخود هۆرس- ڕەیکەکە[49] خۆیان سازو ڕەخت دەدا (بێگومان لەم ڕۆژانەدا نە ئاسنی لغاوو نە هەوسار پێداویست بوون)و بە شێلگیریی هەنگاویان بە دەوروخولی کێڵگەکەدا دەناو بەرازێکیش لەدواوە دەڕۆشتو دەشیراند... جی ی ی ی[50] بۆ پێشەوە هەڤاڵ!. یاخود وۆوو[51] بۆ دواوە هەڤاڵ! ئاوا پێ بە پێی بارودۆخەکە هەموو ئاژەڵێك تەنانەت هەتا لەخۆبووردوترینیشیان لە جووتکردنو کۆکردنەوەی پووشو پەڵاشدا کاریان دەکرد. هەتاکو مراویو مریشکەکانیش ڕەنجیان دەکێشاو سەراپای ڕۆژەکە لەبەر هەتاودا دەهاتنو دەچوونو تاڵەپووشە ناچیزەکانیان بە دەنووکی خۆیان هەڵدەگرتەوە. لە ئاکامدا دروێنەکەیان بە دوو ڕۆژە وەخت کەمتر لەوەی کە خواساییانە لای جۆنزو پیاوەکانی دەیخایاند تەواوکرد. لەگەڵ ئەوەشدا گەورەترین دروێنەکردن بوو کە کێڵگەکە هەرگیز بینیبێتی. هیچ شێوە زیانێکیش نەبوو، مریشکەکانو مراوییەکان بە چاوە تیژەکانی خۆیان هەتا دوا لاسکیشیان کۆکردبۆوە. هیچ یەکێ لە ئاژەڵەکانی سەر مەزراکەش تا ئەو ڕادەیە کە پڕە دەمێکیشیان نەدیبوو بەدرێژایی ئەو هاوینە ئیشوکاری مەزراکە وەکو ئیشکردنی سەعات بەرێوە دەچوو.

---

[49]. Horse- rake : مەکینەی کۆکردنەوەی پووشو پەڵاش.

[50]. Gee : واژەیەکە پێ بە پێی فەرمان بە ئەسپو چارەوی دەدرێت کە خێرا بڕوات, یاخود بەرەو لای ڕاست پێچ بکاتەوە.

[51]. Whoa : واژەیەکە پێ بە پێی فەرمان بە ئەسپو چارەوی دەدرێت تا بوەستێت.

ئاژەڵەکان هێندە کامەران بوون وەکو ئەوەی کە هەرگیز شیاوبوونی ئەو کامەرانییە بە ئەندێشەیاندا ختوورەی نەکردبێ. هەموو خۆراکێکی پڕیەپڕی دەم بێ چوونو چەرا لەزەتێکی قووڵ بوو، ئێستاکە ئیدی بەڕاستی خۆراکی خۆیان بوو، لەلایەن خۆیانەوەو هەر بۆ خۆشیان بەرهەم هێنرابوو، نەوەك خێرو سەدەقەیان لەلایەن ئەربابێکی قێزەونەوە پێبکرێت. بە لە بەینچوونی ئادەمیزادە مشەخۆرو بێ ئەرزشەکان خۆراك بۆ خواردنی هەموو کەسێك زۆر زیاتر بوو, هەروەها وەختی دەستبەتاڵیو ئاسوودەییش پتر بوو، بەهەرحاڵ ئاژەڵەکان بێ ئەزموون بوون. ڕووبەڕووی گەلێك دژواری بوونەوە- هەر بۆ نموونە، ئاخروئۆخری ساڵەکە، کاتێك کە دەغڵو دانەکەیان دروێنە کرد، دەبووایە بەشێوازی دیرۆکانە پێماڵ بکرێو کاوکۆزەرەکەشی بە هەناسەی خۆیان ڕادەن، لەبەرئەوەی کە مەزراکە بەرخورداری مەکینەی کۆمباین[52]نەبوو, کەچی بە هۆشمەندیی بەرازەکانو ماسوولکە مەزنەکانی بۆکسەر هەمیشە یاریدەدری تێپەڕاندنی ئەو کەموکوڕییە بوون. بۆکسەر مایەی ستایشی هەموو کەسێك بوو, هەتا لە زەمانی جۆنزیشدا کارگەرێکی سەختگیر بوو، وەلێ ئێستاکە ئیتر ئەوە مالووم بوو کە زیاتر بە سێ ئەسپ دەچوو وەك لە یەکێك، ڕۆژانی وا هەبوو کە وێدەچوو سەرلەبەری ئیشی مەزراکە کەوتبێتە سەر شانو پلی بەتوانای ئەو. هەر لە بەیانییەوە هەتاکو شەو خەریکی پاڵپێوەنانو ڕاکێشان بوو، هەمیشە لە کوێ ئیش گەلێك سەخت بووایە لە وێندەر بوو. لەگەڵ یەکێك لە کەڵەشێرە چکۆلەکاندا ڕێك کەوتبوو کە بەیانیان

---

[52]. Threshing machine : کۆمباین، دەڕاسە.

نیو سەعات بەر لە هەر یەکێکی دی بانگی بکاتو هەرچیەك کە بەوە بچێت پێداویستییەکی زۆری بەکار هەبێت ئەنجامی هەندێك کاری خۆبەخشی[53] تیادا بدات، بەر لەوەی ئیشی نۆرمەڵی رۆژەکە دەستی پێکردبێ، وەڵامی بۆ هەموو کشەوگرفتێك، بۆ هەموو کۆسپو تەگەرەیەك ئەوە بوو کە: (من سەختتر کاردەکەم!) کە وەکو دروشمە تایبەتەکەی گرتبوویە خۆی.

بەڵام هەموو کەسێك بەپێی توانای خۆی کاری دەکرد. مریشکەکانو مراوییەکان، بۆ نموونە لە دروێنەکردنەکەدا بە کۆکردنەوەی دەنکە پەرتەوازەکان پێنج بووشێل[54] دانەوێڵەیان پاراست. هیچ کەسێك دزی نەکرد، هیچ کەسێك دەربارەی ئازووخەکەی بۆڵەبۆڵی نەکرد، دەمەقاڵەو قەپاڵگرتنو رەشك بردن کە تایبەتمەندێتی نۆرمەڵی زیندەگی رۆژگارە بەسەرچووەکان بوون تەقریبەن رەویبوونەوە. هیچ کەسێك خۆی نەدزییەوە- تەقریبەن هیچ کەسێك خۆی نەدزییەوە. مۆڵی راست بوو، لە وەخەبەرهاتنی بەیانیان کەڵکی نەبوو، خەسڵەتێکی ئەوتۆشی هەبوو کە پێشوەخت بە دەلیلی بوونی کوچکێك لەنێو سمەکەیدا کاری بەجێ دەهێشت. هەڵسوکەوتی پشیلەکەش تا ئەندازەیەك سەیروسەمەرە بوو. هەر زوو ئەوە تێبینی کرا کە کاتێك ئیشوکار هەبووایە بۆ جێبەجێکردن پشیلەکە هەرگیز نەدەدۆزرایەوە. بۆ چەندەها سەعاتی پەیاپەی پێوار دەبوو، دواییش کاتی ژەمەکان دەردەکەوتەوە، یاخود دەمەوئێوارێ دوای

---

53. Volunteer : خۆڕایی کارکردن، خۆبەخشی. تەتەوع.

54. Bushel : پێوەرێکە بۆ گەنم بەکاردەبرێتو بەرابەرە بە هەشت گالۆن.

تەواوبوونی ئیش وەکو ئەوەی کە هیچ شتێك ڕووی نەدابێ, بەڵام هەمیشە بیانووی وا دانسقەی دەهێنایەوەو هێندەش میهرەبانانە مرەمرِی دەکرد، کە مەحاڵ بوو بتوانی باوەڕ بە نیەتە چاکەکانی نەکەیت. بێنجامینی گوێدرێژی بەساڵداچوو هەر لە یاخیگەرییەکەوە وێدەچوو کە فرە نەگۆڕابێت، هەروەکو چۆن لە زەمانی جۆنزیشدا دەیکرد هەر بە هەمان شێوە هێواشیو خودسەرانە کاری خۆی دەکرد، نە هەرگیز خۆی دەدزییەوەو نە قەتاوقەتیش بۆ زیادە ئیش خۆبەخشی دەکرد. دەربارەی یاخیگەرییەکەو دەرەنجامەکانی هیچ بۆچوونێکی گوزارە نەدەکرد، کاتێك لێی پرسرا کە ئایا ئێستاکە جۆنز لەبەین چووە خۆشحاڵتر نیە، تەنها ئەوەی دەوت کە: "گوێدرێژان ماوەیەکی زۆر دەژین، هیچ یەکێك لە ئێوە هەرگیز گوێدرێژێکی مردووی نەبینیووە." و ئەوانی دیش دەبووایە بە پارسڤە پەردەپۆشەکەی قایل بن.

یەکشەممان ئیشوکار نەبوو. قاوەڵتی سەعاتێك پاش کاتی دیاریکراوی خۆی دەکەوتو پاش قاوەڵتیش سێریمۆنییەك[55]هەبوو کە هەموو هەفتەیەك حەتمەن پەیرەوی دەکرا، یەکەمین هەڵدانی بەیداخەکە دەهات. سنۆبۆڵ لە ژووری ڕەخت و تفاقدا ڕوومێزییەکی کۆنی سەوز ڕەنگی مس جۆنزی دۆزیبۆوەو لە سەریدا بە سپی وێنەی سمێكو قۆچێکی کردبوو. ئەمە هەموو بەیانیانی یەکشەممەیەك بۆ سەربێی دارئالای[56] نێو باخچەی خانووی نێومەزراکە هەڵدەکێشرا. ئالاکە سەوز بوو، سنۆبۆڵ ڕاڤەکاری کردەوە، تا کێڵگە سەوزەکانی ئینگلستان بنوێنێ، لە کاتێکدا

---

[55]. Ceremony : مەراسیم.
[56]. Flagstaff : دارئالا. سارییەی ئالا.

سمەکەو قۆچەکەش کۆماری ئاژەڵانی دوارۆژیان دەگەیاند کە ئەو ئانە بەرپا دەبوو کە نەژادی ئادەمیزاد لە ئاکامدا لەناوچووبن. دوای هەڵدانی بەیداخەکە هەموو ئاژەڵەکان بە ڕیزە چوونە نێو تەویلە گەورەکەوە بۆ کۆبوونەوەی گشتی کە بە میتینگ[57] ناسرابوو. ئالێرەدا ئیشی حەوتووی داهاتوو بەرنامەڕێژی دەکراو قەرارەکان پێشکەش دەکرانو دێباتەیان لەسەر دەکرا. هەمیشە هەر بەرازەکان بوون کە قەرارەکانیان پێشکەش دەکرد. ئاژەڵەکانی دیکە هەر ئەوەیان دەزانی کە چۆن دەنگ بدەن، بەڵام قەت نەیاندەتوانی بیر لە هیچ قەرارێکی خۆبەخۆ بکەنەوە. لە دێباتەکاندا سنۆبۆڵو ناپولیۆن چالاکترین کەس بوون, بەڵام تێبینی کرا کە ئەم دووانە هیچ کاتێك ڕێك نەدەکەوتن: هەرچی پێشنیارێك هەر یەکێکیان بیکردایە دەکرا وا دابنرێت کە ئەوی تریان ڕەتی دەکاتەوە. هەتا کاتێك کە چارەسەریش کرابوو- شتێك بوو خۆی لە خۆیدا هیچ کەسێك نەیدەتوانی ڕەتی بکاتەوە- ئەویش ئەوەی کە حەسارە بچکۆلەکەی پشت باخەکە وەکو مەنزڵێك بۆ حەوانەوەی ئەو ئاژەڵانە وەلا بنرێت کە تەمەنی کارکردن تێدەپەڕێنن، دێباتەیەکی تۆفاناویشیان لەسەر تەمەنی ڕاستو دروست بۆ خانەنشین بوونی هەر تاقە گروپە ئاژەڵێك کرد. کۆڕەکە هەمیشە بە چڕینی (گیانەوەرانی ئینگلستان) کۆتایی پێدەهاتو دوانیوەڕوانیش بۆ سەرگەرمی دەستی لێ هەڵگیرابوو. بەرازەکان ژووری- ڕەخت و تفاقیان وەکو بنەکەی فەرماندەیی[58] بۆ خۆ وەلایان نا.

---

[57]. Meeting : کۆبوونەوە، کۆڕ، کۆنگرە.

[58]. Head quarters.

لێره ئێوارەکان لەرێی ئا ئەو کتێبانەی کە لە خانووی نێو مەزراکەوە هێنابوویانە دەرێ خۆیان بە فێربوونی ئاسنگەریی، دارتاشیو بەهرە پێداویستەکانی دیکەوە خەریك کردبوو, سنۆبۆڵ، هەروەهاش خۆی بە رێکخستنی ئاژەڵەکانی ترەوە سەرقاڵ کردبوو تا بیانخاتە نێو ئەوەی کە بە کۆمیتەکانی ئاژەڵان[59] ناوزەدی دەکردن. سنۆبۆڵ ئالەمەدا ماندوونەناس بوو. بۆ مریشکەکان کۆمیتەی بەرهەمهێنانی هێلکەی[60] دامەزراند. بۆ مانگاکان ئەنجومەنی کلکە خاوێنەکانی[61] دامەزراند. کۆمیتەی فێرکردنەوەی هەڤاڵە نارامەکانی[62] دامەزراند (کە ئامانجی ئەمە ماڵیکردنی جرجەکانو کەروێشکەکان بوو)، بۆ مەرەکانیش بزوتنەوەی پەشمی سپی تر[63]و چەندینی تری جۆراوجۆر، بێجگە لە بنیاتنانی کۆمەڵێ پۆل بە خوێندنەوەو نووسینەوە خەریکبوون. بەشێوەیەکی گشتی ئەم پرۆژانە نوشوستیان هێنا. هەوڵو کۆششی ماڵیکردنی بوونەوەرە نارامەکان, بۆ نموونە تەقریبەن دەستبەجێ شکستی خوارد. کەم و زۆر بەتەواوەتی بەردەوام بوون لەوەی هەروەکو جاران رەفتار بکەنو کاتێکیش کە سەخاوەتمەندانە مامەڵەیان لەگەڵدا کرا بە سادەیی سوودگیریی[64] فرسەتەکەیان کرد. پشیلەکە پەیوەندی بە کۆمیتەی فێرکردنەوە کردو بۆ چەند رۆژێك تیایدا گەلێك چووستو چاپووك بوو. رۆژێك بینرا

[59]. Animal Committees.
[60]. Egg production Committee.
[61]. Clean Tails league
[62]. Wild Comrades Reeducation Committee
[63]. Whiter wool Movement
[64]. Advantage : سوودگیریی. هەلزانی کردنو ئیستیغلالکردنی فرسەت.

لەسەر سەربانێکدا دانیشتووەو لەگەڵ چەند پارسایەکدا دەدوێت کە ڕێك لە دەرەوەی دەستپێگەشتنی ئەودا بوون. پێی دەوتن کە ئێستا ئیدی هەموو ئاژەڵەکان هەڤاڵن و ئەوەش کە هەر پاسارییەك پەسەندی بێت دەتوانێ بێت و لەسەر چنگۆڵەی هەڵبنیشێ، بەڵام پاسارییەکان مەودای خۆیانیان هەر هێشتەوە.

پۆلەکانی خوێندنەوەو نووسینیش بەهەرحاڵ سەرکەوتنێکی مەزن بوو. کاتی پایز تەقریبەن هەموو ئاژەڵێك لەسەر مەزراکەدا تاڕادەیەك خوێندەوار بوو. سەبارەت بە بەرازەکانیش ئێستا ئیدی دەیانتوانی پێرفێکتانە بخوێننەوەو بنووسن. سەگەکانیش تا ئەندازەیەکی باش فێرببوون بخوێننەوە، بەڵام بێجگە لە حەوت ڕاسپاردەکان مەیلی خوێندنەوەی هیچ شتێکیان نەبوو. میوریەڵ- گیسکەکە دەیتوانی ڕۆژانەکان بۆ ئەوانەی تر بخوێنێتەوەو هەندێکجاریش وا ڕاهاتبوو ئێوارەکان ئەو پارچە ڕۆژنامانە بۆ ئەوانەی تر بخوێنێتەوە کە لەسەر کەڵەکەی زبڵدانەکەدا دەیدۆزینەوە. بێنجامین هەروەکو هەموو بەرازێکی تر دەیخوێندەوە، بەڵام هەرگیز قابیلیەتی خۆی بەکارنەدەهێنا. ئەوەندەی کە دەیزانی دەیوت هیچ شتێك نیە شایانی خوێندنەوە بێت. کلۆڤەر سەرجەم ئەلفوبێ فێر ببوو، وەلێ نەیدەتوانی وشەکان پێکەوە کۆبکاتەوە. بۆکسەر نەیدەتوانی بگاتە ئەو لاوەی پیتی (D) لەنێو تۆزو خاکەکەدا بە سمە مەزنەکەی خۆی ڕەسمی (D.C.B.A) دەکردو ئینجا دەوەستاو بە دوو گوێی بەرەو دواوە نووشتاوەوە چاوی دەبڕییە پیتەکان. هەندێکجاریش کاکۆڵی خۆی ڕادەوەشاند، بە هەموو توانای خۆیەوە تەقەلای دەدا وەبیریدا بێتەوە کە دوای ئەوە چی دێت و هەرگیزیش سەرکەوتوو نەبوو. لە چەندین

بۆنەدا بێگومان فێری (H.G.F.E)ش بوو، بەڵام هەتا ئەو کاتەی کە ئەو فێریان دەبوو هەمیشە پەی بەوە دەبرا کە (D.C.B.A)شی لەبیر چوونەتەوە. لە ئاکامدا قەراری دا کە هەر بەو چوار پیتەی یەکەم قایل بێتو ڕاهاتبوو هەموو ڕۆژێك یەکجار, یاخود دووجار دەینووسینەوە هەتاکو یادی خۆی وەئاگا بهێنێتەوە. مۆڵی ڕەتی دەکردەوە کە هیچ شتێك فێر بێت تەنها ئەو پێنج[65] پیتانەی کە ناوی خۆیان پێکدەهێنا. گەلێك بە پوختی بە پارچەی چیلکەکان فۆڕمی بە مانە دەداو پاشانیش بە گوڵێك یاخود دوو دانە دەی ڕازاندەوەو بە پەسندکردنەوە بە دەوریاندا دەسوڕایەو هیچ یەکێ لە ئاژەڵەکانی تری سەر مەزراکە لە پیتی (A) دوورتر نەدەکەوتەوە، هەروەها پەی بەوەش برابوو کە ئاژەڵە گەمژەترەکانی وەکو مەڕەکان، مریشکەکانو مراوییەکانیش لە تواناییاندا نیە کە حەوت ڕاسپاردەکان ئەزبەر بکەن. پاش گەلێك تێفکرین سنۆبۆڵ ڕایگەیاند کە لەڕاستیدا حەوت ڕاسپاردەکان دەکرێ بۆ تاقە حیکمەتێکی لەم شێوەیە پوخت بکرێنەوە: (چوار قاچ باشە، دوو قاچ خراپە) ئەمە سنۆبۆڵ وتی، بریتیە لە پڕەنسیپی بنچینەیی ئاژەڵیزم. هەر کەسێك بەتەواوەتی قۆزتبێتیەوە لە کاریگەرییەکانی ئادەمیزاد پارێزراو دەبێت. پەلەوەرەکان سەرەتا ڕەتیان کردەوە، چونکە بۆ ئەوان وا دەردەکەوت کە ئەوانیش هەروەها دوو قاچیان هەبوو، بەڵام سنۆبۆڵ بۆی سەلماندن کە ئەمە ئاوا نەبوو. (باڵی

---

[65] . بێگومان پیتەکانی ناوی مۆڵی (Mollie) شەش پیتو پێنج نین. داخۆ چۆن بەسەر جۆرج ئۆرۆیلدا گوزەری کردبێ؟

هەر باڵندەیەك هەڤالآن) سنۆبۆڵ وتی: " ئۆرگانێکی پاڵنەرەو دەستکار[66] نیە، بۆیە پێویستە بە قاچ لە قەڵەم بدرێت. نیشانەی بەرجەستەکەری مرۆڤ، دەستە، ئامرازێکە کە هەموو شەڕەنگێزییەکانی پێ ئەنجام دەدات".

باڵندەکان وشە درێژەکانی سنۆبۆڵ تێنەگەشتن، بەڵام ڕاڤەکردنەوەیان قبووڵ کردو سەرجەم ئاژەڵە بێ فیزەکان بۆ فێربوونو ئەزبەرکردنی حیکمەتە نوێیەکە کەوتنە کار. (چوار قاچ باشە، دوو قاچ خراپە) لەسەر دیواری کۆتایی تەویلەکەدا، لە سەرووی حەوت ڕاسپاردەکانەوەو بە پیتی گەورەتر نووسرابوو. کاتێك کە مەڕەکان بە یەکجار ئەزبەریان کرد، لە ناخیاندا بۆ ئەم پەندە پابەندییەکی مەزن نەشونمای کردو زۆرجار کە لە کێڵگەکەدا پاڵدەکەوتن هەموو دەستیان دەکرد بە باڕەباڕکردنی (چوار قاچ باشە، دوو قاچ خراپە! چوار قاچ باشە، دوو قاچ خراپە!)و بۆ چەندین سەعاتی دوانەهاتوو بەردەوام دەبوون، هەرگیز لێی شەکەت نەدەبوون.

ناپولیۆن بایەخی بە کۆمیتەکانی سنۆبۆڵ نەدەدا. ئەو ئەوەی وت کە پەروەردەو فێرکردنی لاوان گەلێك گرنگتر بوو لە هەموو ئەو شتانەی کە دەکرا بۆ ئەوانە ئەنجام بدرێت کە ئیدی گەورە ببوون. وا ڕێکەوت کە جێسیو بلوبێڵ هەردووکیان هەر زوو پاش دروێنەکردنی پووشو پەلاشەکە زاوزێیان کرد، بە هەردووکیانەوە نۆ توڵەسەگی بەهێزیان زایی. هەر کە لە شیر بڕانەوە دەستبەجێ ناپولیۆن لە دایکیان جودای کردنەوە، ئەوەی وت کە خۆی دەبێتە بەرپرسی پەروەردەو فێرکردنیان.

---

Manipulation . [66] : واتە لەبری دەستکاریی ئەنجام بدرێت, یاخود کاری دەست ئەنجامدان.

بردیانی بۆ سەرەوە بۆ نێو ئەو لۆفتەی[67] کە تەنها بە قالدرمە دەکرا لە ژووری- ڕەخت و تفاقەکانەوە زەفەری پێ ببرێتو لەوێدا لە گۆشەپەرێزییەکی ئەئاوا حەشاریدان کە ئەوانی دیکەی مەزراکە هێندەی نەبرد بوونی ئەوانیان لەبیر کرد.

لوغزئامێزیی ئەوەی کە شیرەکە بۆ کوێ دەچوو هێندەی نەبرد ئاشکرابوو. هەموو ڕۆژێ تێکەڵی نێو ماشی بەرازەکان دەکرا. سێوە نۆبەرەکان ئیتر خەریکی پێگەشتن بوونو گیای باخەکەش بە بابڕدەڵەکان[68] پیس ببوو. ئاژەڵەکانیش وایان دانابوو کە شتێکی چاوەڕوان کراو بوو کە ئائەمانە بە یەکسانی هاوبەشی بکرێن، ڕۆژێك بەهەرحاڵ فەرمان پەخش بۆوە کە هەموو بابردەڵەکان دەبێ گردبکرێنەوەو بۆ ژووری- ڕەخت و تفاقەکان ببرێن، بۆئەوەی بەرازەکان بەکاریان بهێنن, بەرامبەر بەمە هەندێك لە ئاژەڵەکانی تر ورتەورتیان کرد، بەڵام بێ سوود بوو. تێکڕای بەرازەکان لەسەر ئائەم خاڵەدا لە ڕێکەوتنێکی تەواودا بوون. هەتا سنۆبۆڵو ناپولیۆنیش سکویلەر نێررا بوو هەتا بۆ ئەوانی دی ڕوونکردنەوەی پێداویست ئەنجام بدات.

(هەڤالان) هاواری کرد.. "ئومێدەوارم وێنای ئەوە نەکەن کە ئێمەی بەراز بە ڕۆحیەتێکی خۆپەرستانەو ئیمتیازدارانەوە ئەمە ئەنجام دەدەین؟ زۆربەمان ئەوی ڕاستی بێ ڕقمان لە شیرو سێوە. من خۆم ڕقم لێیانە. ئامانجی تاقانەی ئێمە لە

---

[67] Loft : ژووری سەرەوە، باڵەخانە. ژووری لە بەرزایی.

[68] Windfalls : هەر شتێك بە هەڵکردنی با بکەوێت ئیدی گەڵا بێت, یاخود میوەی درەخت.

بەکارهێنانی ئەم شاتە ئەوەیە کە تەندروستی خۆمان بپارێزین. شیرو سێو (ئەمە لەلایەن زانستەوە سەلمێنراوە هەڤالان) بریتین لەو ماددانەی کە بەبێ چوونو چەرا گرنگن بۆ خێرو تەندروستی بەراز. ئێمەی بەراز کارگوزاری هزرو هۆشین. تەواوی بەڕێوەبردنو ڕێکخستنی ئەم مەزرایە پشت بە ئێمە دەبەستێت. ڕۆژو شەو ئێمە بەسەر خێرو ئەمنو ئاسایشی ئێوەوە چاودێرین. لەپێناوی ئێوەدایە کە ئەو شیرە دەنۆشینو ئەو سێوانەش دەخۆین. ئایا دەزانن چی ڕوودەدات ئەگەر ئێمەی بەراز لە ئەرکەکانی خۆمان نوشوستی بهێنین؟ جۆنز دەگەڕێتەوە! بەڵێ، بێگومان، جۆنز دەگەڕێتەوە! هەڤالان". سکویلەر تەقریبەن دامارگیرانە قیژاندی. لە ملاوە بۆ ئەولا هەڵدەبەزییەوەو کلکی دەلەقاند: "بێگومان هیچ کەسێك لە بەینی ئێوەدا نیە کە بیەوێت گەڕانەوەی جۆنز ببینێت؟"

ئێستا ئەگەر ئیدی شتێك هەبووایە کە ئاژەڵەکان هەموو بەتەواوەتی خاترجەم بن دەربارەی، تەنها ئەو شتە بوو کە گەڕانەوەی جۆنزیان نەدەویست. کاتێك کە لەم نوختە نەزەرەوە گوزارەیان بۆ کردبوون، ئیدی هیچی تریان نەبوو بیڵێن. بایەخی هێشتنەوەی بەرازەکان لە تەندروستیەکی چاکدا زیاتر لە پێویست ڕوونو ئاشکرا بوو، بۆیە بەبێ وتووێژی زیاتر قبووڵیان کرد کە شیرو سێوە بابردەڵەکان (هەروەها بەروبوومی سەرەکی سێوەکان کاتێك کە پێگەیشتن) دەبێ هەر بە تەنها بۆ بەرازەکان بپارێزرێت.

# بەشی چوارەم

لە کۆتایی هاویندا باسو خواسی ئەوەی چی لە مەزرای ئاژەڵاندا ڕوویدا بوو بە سەرانسەری لایەکی هەرێمەکەدا بڵاوبۆوە. هەموو ڕۆژێك سنۆبۆڵو ناپولیۆن چەندین گەشتی ئەو کۆترانەیان دەنارده دەرێ کە ڕێنماییەکانیان ئەوە بوو لەگەڵ ئاژەڵانی مەزرا دراوسێکاندا تێکەڵاو بن، سەربووردەی یاخیگەرییەکەیان پێ ڕابگەیەننو نەوای گیانەوەرانی ئینگلستانیان فێر بکەن.

مستەر جۆنز زۆربەی وەختەکەی دانیشتوو لەنێو مەیخانەی ڕێدلایەن لە ویلێنگدۆندا بەسەر دەبرد. بۆ هەریەکێك کە گوێی هەڵخستایە دەربارەی ئەو نادادپەروەرییە غۆلئاسایە سکاڵای دەکرد کە بە دەستیەوە پەژارەی ئەوەی چەشت کە لەلایەن دەستەیەك ئاژەڵی بەکەڵی-هیچ- نەهاتووەوە لە موڵك و ماڵی خۆی وەدەر نرابوو. مەزراگەڕەکانی دی لە ڕاستیدا بەزەییان پێیدا

دەهاتەوە، بەلام لە سەرەتادا هیچ یارمەتییەکی ئەوتۆیان نەدا. لە ناخی دڵەوە هەریەکێك لەوانە پەنامەکانە ئەوەی لێك دەدایەوە کە ئاخۆ بەهەر شێوەیەك بێت ناتوانێت چارەڕەشییەکەی جۆنز بۆ بەرژەوەندیو سوودی خۆی وەربچەرخێنێ. خۆشبەختی بوو کە ساحێبی ئەو دوو مەزرایەی کە هاوسنووری مەزرای ئاژەلان بوون هەمیشە لە هەلومەرجێکی خراپدا بوون. یەکێك لەوانە کە بە (فۆکس وود)[69] ناسرابوو، مەزرایەکی گەورەی ئەفەرۆزکراوی کۆنە شێواز بوو، کە تێکڕای لەوەڕگاکانی داهێنراوو هێجەکانیشی لە حاڵو بارێکی شەرماوەردا بوونو بێشەلانی چڕوپڕ دایگرتبووەوە. خاوەنەکەی مستەر (پیلکینگتۆن)[70] مەزراگەرێکی نەجیبزادەی خۆش ڕەفتار بوو[71] زۆربەی کاتەکەی لە ماسیگرتن، یاخود ڕاوشکاری هاوگونجاوی لەگەڵ مەوسمدا بەسەر دەچوواند. مەزراکەی دیکەش، کە بە (پینچ فیلد)[72] ناودێر کرابوو بچووکترو باشتر پارێزگاری لێ کرابوو. خاوەنەکەی مستەر (فرێدریك)[73] بوو، پیاوێکی کەللەشەقی زۆرزان بوو. هەمیشە سەروکاری لە کێشە دادگاییەکاندا هەبوو, لەگەڵ شۆرەتێکیش بۆ زۆربلێی لە مامەڵەکانیدا. ئەم دوو زاتە هێند ڕقیان لێکدی دەبۆوە کە ئیدی دژوار بوو بگەنە هیچ ڕێکەوتنێك، هەتا لە بەرگریکردن لە بەرژەوەندیەکانی خۆشیان. لەگەڵ ئەوەشدا هەردووکیان بەتەواوەتی لە یاخیگەرییەکەی مەزرای

---

[69]. Foxwood.
[70]. Pilkington.
[71]. Easy-Going .
[72]. pinch Field
[73]. Mr Ferderick

ئاژەڵان سڵەمیبوونەوەو فرەش خواستاری ئەوە بوون کە بەرهەڵستی ئاژەڵەکانی خۆیان بکەن لەوەی کە زیاتری دەربارە شارەزا نەبن. لە سەرەتادا وایان دەرخست کە قەشمەری بەو ئایدیایە دەکەن کە ئاژەڵان بۆ خۆیان سەرپەرشتی مەزرایەك دەکەن. وتیان: "لە دوو هەفتەدا هەموو شتەکە کۆتایی پێدێت." بڵاویانکردەوە کە ئاژەڵەکانی سەر مەزرای مانەر (لەسەر ناوهێنانی بە مەزرای مانەر پێیان دادەگرت، بەرگەی ناوی مەزرای ئاژەڵانیشیان نەدەگرت). سەرومڕ لە مەعبێنیاندا شەڕوشۆڕو هەرا هەبوو, هەروەها بەخێراییش لە برساندا دەمردن. کە کات تێپەڕی و ئاژەڵەکانیش وەکو دەرکەوت لە برساندا نەمردن، فرێدرك‌و پیلینگتۆن ئاوازەکەی خۆیان گۆڕیو دەستیان کرد بە ئاخاوتن دەربارەی ئەو شەڕەنگێزییە وەحشەتناکەی کە ئێستاکە ئیدی لەسەر مەزرای ئاژەڵاندا گەشەی کردبوو. ئەوە ڕاگەیەنرابوو کە ئاژەڵەکان لەوێدا پراکتیزەی کانیباڵیزمیان[74] دەکرد، بە ناڵی سوری- داخکراوی ئەسپ ئەشکەنجەی یەکتریان دەداو لە مێینەکاندا هاوشەریکییان دەکرد. لە سەرپێچیکردن لە دژی یاساکانی سروشت هەر ئەمە پەیدا دەبێت. فرێدریك‌و پیلکینگتۆن وتیان: "هەرچۆنێك بێت ئەم حیکایەتانە قەت بەتەواوەتی باوەڕیان پێنەکرا. بەندوباو لەبارەی ئەو مەزرا بێ هاوتایەی کە ئادەمیزادی تیا وەدەرنرابوو ئاژەڵەکانیشی کاروبارەکانی خۆیان بەرێوە دەبرد، بەردەوامبوو لە بڵاوبوونەوە لەنێو کۆمەڵە شەقڵێکی شێواوو نادیارداو بەدرێژایی ئەو ساڵەش بزاڤێکی شۆڕشگێڕانە بەناو ئاواییەکەدا پەخش

[74]. Cannibalism : ئادەمخۆریی، مرۆڤخۆریی.

بووەوە. گاگەلێك کە هەردەم ملکەچو ڕامبوونە ناگەهان بوون بە ناڕامو دڕندە، مەڕومالآت هێجەکانیان تێکتەپاندو سێپەڕەیان ماشییەوە، مانگاکان بە لەقە سەتڵەکانیان قلّپ کردەوە، ئەسپەکان پشتیرەکانیان ڕەتکردەوەو سوارەکانیان بەرەو لایەکی دیکە توورِ هەڵدا. لەسەرووی هەموو شتێکیشەوە نەواو هەتا پەیڤەکانی گیانەوەرانی ئینگلستانیش لە هەموو شوێنێکدا ناسرابوون. بە خێراییەکی سەرسامهێنەر بلآوببۆوە. ئادەمیزادەکان کاتێك کە گۆرانییەکەیان ژنەفت نەیانتوانی غەزەبی خۆیان بتەننەوە، بەهەرحاڵ وایان دەرخست کە لەو باوەڕەدان کە هەر تەنها شتێکی گاڵتەجارانەیەو هیچی تر. نەیاندەتوانی حاڵی بن, وتیان: "چۆن ئاژەڵان هەتاکو دەشتوانن خۆیان بەکێش بکەن بۆ چڕینی شتێکی ئاوا هیچوپووچو سووكو ڕسوا؟!" هەر ئاژەڵێکیش لەسەر چڕینەوەی بگیرابایە دەستبەجێ بە جەڵدەلێدانیان دەسپارد. هێشتاش گۆرانییەکە نەدەچەپێنرا. باڵندە ڕەشەکان لەنێو هێجەکاندا بە فیکەفیك دەیان وتەوە، کۆترەکان لەنێو درەختی نارەوەنەوە بە گمەگم دەیان وتەوە، هەتا تێهەڵکێشی ناو هەراو تەقو تۆقی ئاسنگەرانو ئاوازی زەنگی کڵێسەکانیش بوو. کاتێکیش کە ئادەمیزادەکان گوێبیستی بوون بەدزییەوە کەوتنە هەڵلەرزین، تیایدا گوێیان لە پێشبینی ئایندەی شوومی خۆیان دەبوو.

سەرەتای ئۆکتۆبەر، کاتێك کە دانەوێڵەکە بڕایەوەو کۆمەڵکراو بەشێکی پێشتر کوترابوو، گەشتی کۆترەکان بە سووڕانەوە لە ئاسمانەکاندا هاتنەوەو بە کێویترین ورووژانەوە لەنێو حەوشەو بانی مەزرای ئاژەڵاندا نیشتنەوە. جۆنزو

هەموو پیاوەکانی لەگەڵ نیو دەرزەنی دیکە لە فۆکس ودو پینج فیلدەوە هاتبوونە ناوەوەی دەروازەی پێنج -شیشەوەو بەو ڕێگا- گالیسکەییەی کە دەچۆوە سەر مەزراکە بەرەو سەرێ دەبوونەوە. سەرجەم تێلایان هەڵگرتبوو، تەنها جۆنز نەبێ کە تفەنگێك لە دەستەکانیدا بوو بەرەو پێشەوە ڕێپێوانی دەکرد. بە ڕوونو ئاشکراییەوە بەتەمای دەستپێشکەری ئەوە بوون کە سەرلەنوێ مەزراکە بگرنەوە. ئەمە دەمێك بوو چاوەڕوان کرابوو، هەموو ئامادەکارییەکان ئەنجام درابوون. سنۆبۆڵ کە کتێبێکی کۆنی موتالا کردبوو کە لەبارەی شالاوە سەربازییەکانی (یۆلیۆس سیزەر)ەوە[75] بوو کە لە خانووی نێو مەزراکەدا دەستگیری ببوو، سەرپەرشتیاری ئۆپەراسیۆنەکانی بەرگریکردن[76] بوو. بەخێرایی فەرمانەکانی خۆی دەداو لەماوەی دوو دەقیقەدا هەموو ئاژەڵێك جێی خۆی گرتبوو.

کە ئادەمیزادەکان لە خانووبەرەکانی مەزراکەوە نزیکبوونەوە، سنۆبۆڵ هەوەڵێن پەلاماری خۆی دەستپێکرد. هەموو کۆترەکان، هەتاکو ژمارەی سیو پێنج بە سەر سەری پیاوەکانەوە هاتووچوون، فڕینو جیقنەکانیان لە نێوەندی ئاسمانەوە بەسەریاندا بەردایەوەو کاتێکیش کە پیاوەکان خەریكو سەرقاڵی ئەمە بوون, قازەکان کە لە پەنای هێجەکاندا خۆیان مەڵاسدابوو دەرپەڕینە دەرێو دڕندانە دەنووکیان لە پوزیان گرت. بەهەرحاڵ ئەمە تەنها پێکادانو مانۆڕێکی[77]

[75]. Julius Caesar
[76]. Defensive operations
Manoeuvre . [77] : موناوەرات، مەشقی سەبازیی. مانۆڕ .

سووك بوو. تەنها مەبەستی ئەوە بوو کە ئاشووبێکی بچکۆلانە بخولقێنێ، بەلام پیاوەکان بەئاسانی قازەکانیان بە تێلاکان دوورخستەوە. سنۆبۆڵ ئینجا دووەمین خەتی هێرشی خۆی دەستپێکرد. میوریەڵو بێنجامینو هەموو مەڕەکان، سنۆبۆڵیش لە پێشیانەوە بە پرتاو بەرەو پێشەوە چوون لە هەموو لایەکەوە خۆیان تێوەژەندنو کەللەیان لە پیاوەکان داو بێنجامینیش لای کردەوەو بە سمە بچکۆلەکانی پیایدا کێشان، بەلام جارێکی تر پیاوەکان بە تێلاکانو پووتە مێخدارەکانیانەوە[78] کە زیاد لەپێویست بۆ ئەوان بەهێز بوون کە پێیان بوێرن، بەلام لەپڕێکا لە وەرامی قیژەکەی سنۆبۆڵدا کە ئیشارەت بوو بۆ پاشەکشەکردن، هەموو ئاژەڵەکان وەرچەرخان و لە ڕێگاکەی بەردەمی دەروازەکەوە بەرەو نێو حەوشەو بانەکە هەلاتن.

پیاوەکان هاوارێکی سەرکوت ئامێزیان بەرەلا کرد. ئەوەیان بینی کە وێنایان کردبوو، نەیارەکانیان لە ئانی هەلاتندا بینیو بە هەراوزەناوە بەدوایاندا پەلاماریان دان. ئەمە ئەوە بوو کە سنۆبۆڵ دەرخواستی دەکرد. هەر کە بەتەواوەتی کەوتنە ناو حەوشەو بانەکە، هەر سێ ئەسپەکە هەر سێ مانگاکەو ئەو دوای بەرازەکە، کە لەنێو کاوشێدەکەدا[79] لە بۆسەدا پاڵکەوتبوون، لەناکاو لە پشتیانەوە دەرکەوتنو ڕێگاکەیان لێ بەستن. سنۆبۆڵ ئینجا بۆ پەلاماردانەکە

[78]. Hobaniled Boots.

[79]. Cowshed : ژوورۆچکەیەك، یاخود کەپرۆکەیەك بۆ دالدەدانی ئاژەڵ، بەتایبەتی مانگاو بەکاریشی دەهێنن بۆ جێگادۆشین.

ئیشارەتی کرد. ئەو خۆی ڕێك و ڕەوان هەڵمەتی بۆ جۆنز برد. جۆنز کە بینی وا دێت تفەنگەکەی هەڵبڕیو تەقەی کرد. گوللەکان بە سەرتاسەری پشتی سنۆبۆڵەوە شوێنەواری زنجیرە خەتێکی خوێناوییان بەدی هێناو مەڕێکیش کوژرا. بەبێئەوەی بۆ ساتێکیش ئێست بگرێت سنۆبۆڵ قورساییە پاردە ستۆنییەکەی[80] خۆی بە قاچەکانی جۆنزدا کێشا. جۆنز پەڕییە نێو کەڵەکە شیاکەیەکەوەو تفەنگەکەشی لە دەستەکانییەوە دەرچوونو پەڕین, بەڵام لە هەموو دیمەنەکان ترسناکتر هینەکەی بۆکسەر بوو کە بەسەر قاچەکانی دواوەیدا هەستایەوەو سمەناڵ- ئاسنینە مەزنەکانی خۆی ستالیۆن ئاسایەك[81] وەشاند. لە یەکەمین پیاکێشانیدا زەفەری بە کەللەسەری کوڕێژگەی- تەویلەکەی[82] فۆکس وددا بردو بیٚ گیان لەنێو قوڕەکەدا درێژی کرد.

هەر دوای بینینی ئەمە... هەندێك لە پیاوەکان تێلاکانی خۆیان توورِ هاویشتو هەولّی هەلاّتنیان دا. دەستەپاچەیی بەسەریاندا زالّبوو، ساتی دوای ئەوە هەموو ئاژەڵەکان پێکەوە بە دەوروخولی حەوشەو بانەکەدا کەوتبوونە ڕاوەدونانیان. زامدار کران، جووتکەیان لیٚ وەشێنرا، گازیان لێگیرا، پێماڵ کران. ئاژەڵێك لەسەر مەزراکەدا نەبوو کە بەگوێرەی خۆی تۆڵەی نەکردبێتەوە. هەتا پشیلەکەش لەناکاو لە سەربانێکەوە خۆی هەڵدایە سەر شانی مانگاوانەکەو

---

. [80] Stone : یەکەی کشە لە ئینگلستاندا بەرامبەرە بە شەش کیلۆو (342) گرام.

. [81] Stallion : ئەسپی نەخەسێنراو.

. [82] Staable : ئەو نەوجەوانەی لە تەویلەدا ئیش دەکات.

چنگۆڵەکانی لەنێو ئەسکوردیدا نوقووم کرد، کە بەو هۆیەوە ترسناکانە دای لە نەعرە. لەو چرکەساتەدا کە دەرفەت ڕەخسا پیاوەکان هێندە بەوە خەنیبوون کە بە تالووکە بچنە دەرەوەی حەوشەو بانەکەو بەرەو جادە سەرەکیەکە تێی بتەقێنن. بەم شێوەیە لەماوەی پێنج خولەکی داگیرکردنەکەیاندا بەهەمان ئەو ڕێگایەی کە پیایدا هاتبوون لە پاشەکشێیەکی شەرمئاوەردا بوونو بەدرێژایی ڕێگاکەش ڕەوەیەك قازی بە سرپەسرپ بە دوایانەوە بوونو دەنووکیان لە بەلەکیان دەگرت.

هەموو پیاوەکان ڕۆشتبوون تەنها یەکێکیان نەبێت. لەوێ لە حەوشەکەدا بۆکسەر سمەکەی بە کوڕیژگەی- تەویلەکەدا دەماڵی کە دەمەوخوون لەنێو قوڕەکە درێژ ببوو، تەقەلای دەدا هەڵی بگێڕێتەوە. کوڕیژگەکە تەکانی نەدەخوارد.

مردووە بۆکسەر بە خەمباریەکەوە وتی: "من نیەتی ئەنجامدانی ئەوەم نەبوو. لەبیرم چوو بوو کە ناڵی- ئاسنینم لەپێدایە. کێ باوەڕ بەوە دەکات کە من ئەمەم بە ئەنقەست نەکردووە؟"

"سێنتە مێنتاڵێتیمان[83] ناوێ، هەڤاڵ" سنۆبۆڵ هاواری کرد کە هێشتا هەر لە زامەکانیەوە خوێن دادەچۆڕێ. جەنگ جەنگە. تاقە ئادەمیزادی باشیش تەنها ئەو ئادەمیزادەیە کە مردبێت.

"ئارەزووی ئەوەم نیە ژیان بەرزەفت بکەم, نەك هەتا ژیانی ئادەمیزادیش" بۆکسەر دووپاتی کردەوەو چاوەکانی لێوانلێو ببوون لە ئەشك.

---

[83] . Sentimentality : سۆزداری. عەتفو بەزەیی پێداهاتنەوە.

"مۆڵی له کوێیه؟" یەکێك شیتاندی.

لەراستیدا مۆڵی ون ببوو. بۆ چرکەساتێك نیگەرانییەکی مەزن کەوتە ئاراوە، ترسان لەوەی نەوەك پیاوەکان بەجۆرێك ئازاریان پێگەیاندبێت، یاخود لەگەڵ خۆیاندا بردبێتیان. بەهەرحاڵ لە ئاکامدا سەری لە مابێنی پووش و پەڵاشی ئاخورەکەدا نێژراو بە خۆشاردراویی لەنێو بەستنگاکەی خۆیدا دۆزرایەوە, کە هەر لەگەڵ تەقینی تفەنگەکەدا دالّدەی بردبووە بەر هەلاّتن. کاتێکیش کە ئەوانەی تر هاتنەوە لە گەرانەکانیان بەدوایدا پەی بەوە برا کە کورپێژگەی- تەویلەکە، کە لە هەقیقەتدا بێهۆش ببوو، لەو کاتەدا هاتبووەوە هۆش خۆی و ئەو ناوەی بەجێهێشتبوو.

ئینجا دیسانەوە ئاژەڵەکان لە کێویترین وروژاندا گردبوونەوەو هەریەکەو بە بلّندترین دەنگوباسی سەرهاتەکانی خۆی لەنێو شەرەکەدا دەگێرایەوە. دەستبەجێ ئاهەنگێکی سەرپێیی بۆ سەرفرازیو بردەنەوەیان بەرپا کرا. ئالاّکە شەکێنرایەوەو گیانەوەرانی ئینگلستانیان چەند جارێك چرییەوەو ئەوسا بۆ ئەو مەرەی کە کوژرا بوو ماتەمێکی پیرۆزیان گێراو بنچەدارێکی گۆیژە کێویلەش[84] لەسەر گۆرەکەی چێنرا. لە تەنیشت قەبرەکەیەوە سنۆبۆڵ گوتارێکی بچکۆلانەی پێشکەش کرد، پێی لەسەر ئەوە دادەگرت کە ئەگەر پێویست بکات ئەوا دەبێ هەموو ئاژەڵەکان بۆ مەزرای ئاژەڵان تەیاری خۆبەختکردن بن.

---

[84] Hawthorn bush.

ئاژەڵەکان بە ڕێکەوتنی ڕاوبۆچوون بڕیاریاندا مێداڵێکی سەربازی (پاڵەوانی ئاژەڵان، پلە یەك) ئافەریدە بکەن کە هەر لەو ئانوساتو جێگایەدا بە سنۆبۆڵو بۆکسەر بەخشرا. کە بریتیبوو لە مێداڵێکی برۆنز (کە لە ڕاستیدا هەندێك هۆرس- براسی[85] کەونارا هەبوون کە لەنێو ژووری- ڕەخت و تفاقەکاندا دۆزرابوونەوە)، بۆئەوەی لە یەکشەممەکانو ڕۆژانی پشوودا لەخۆ بدرێت.

هەروەها (پاڵەوانی ئاژەڵان، پلە دوو) هەبوو کە لەپاش مەرگی مەڕە مردووەکە پێی بەخشرا، چەندەها گفتوگۆ دەربارەی ئەوە کرا کە دەبێ ناوی ئەو شەڕە چی بنرێت؟ لە سەرەنجامدا ناوی نرا (شەڕی کاوشێدەکە) بەهۆی ئەوەی کە بۆسەکە لەوێوە دەرپەڕەیبوو.

تفەنگەکەی مستەر جۆنز بە کەوتوویی لەنێو هەشەکەدا دۆزرایەوەو پەی بەوە برا کە لە خانووی نێو مەزراکەدا زەخیرەی فیشەکیش هەبووە, بۆیە بڕیاردرا تفەنگەکە وەکو دەزگاتۆپێك[87] لەپاڵ دێمی دارئالآکەدا دابنرێتو ساڵی دووکەڕەتیش بیتەقێنن- کەڕەتێکیان لە دوانزەی ئۆکتۆبەردا، ساڵڕۆژی شەڕی کاوشێدەکەو کەڕەتەکەی ترشیان لە میدسەمەردەی[88] ساڵڕۆژی یاخیگەرییەکەدا.

---

Horse-Brass . [85] : برۆنزێکی پانکەڵەی خڕە کە بۆ ڕازاندنەوەی ڕەختی ئەسپی باربەر بەکاردێت.

. Battle of the Cowshed

[87] . واتە وەکو تۆپخانە بەکاربرێت.

. Midsummer: ڕۆژی ناوەڕاستی هاوین کە دەکاتە ڕۆژی (24)ی حوزەیران.

# بەشی پێنجەم

کە زستان نزیك کەوتەوە مۆڵی زیاترو زیاتر دژوارو بێزاکەر ببوو. هەموو بایەنییەك بۆ ئیشکردن دوادەکەوتو بە وتنی ئەوەی کە لە خەودا مابۆوە پۆزشی بۆ خۆی دەهێنایەوە، ئەگەرچیش کە ئیشتیایەکی نایابی هەبوو, بەڵام دەربارەی چەردە ئازارێکی نهێنی ئامێز سکاڵای دەکرد. لە سۆنگەی هەموو جۆرە بیانوویەکیشەوە لە ئیش ڕایدەکردو دەچوو بۆلای ئەستێلکی ئاوخواردنەوەکەو لەوێدا گەمژانە دەوەستاو لە ڕەنگدانەوەی نێو ئاوەکەی خۆی ڕادەما, بەڵام هەر ئاوا دەمگۆ دەربارەی شتێکی لەوەش جیددی تر لە ئارادا بوو. ڕۆژێك کە مۆڵی سەڵڵانە بە شادمانییەوە لەنێو حەوشەکەدا هاتوچۆی دەکرد، کلکە درێژەکەی دەلەقاندو سەرقاڵی جوینی لاسکە پووشێك بوو، کلۆڤەر بردیە ئەولاوە.

مۆڵی کلۆڤەر وتی: "شتێکی زۆر جیددیم هەیە پێتی ڕابگەیەنم. من ئەم بەیانییە تۆم بینی دەتڕوانیە ئەو دوو ئەم هێجەی کە مەزرای ئاژەڵان لە (فۆکس

ود) جیادەکاتەوە. یەکێك لە پیاوەکانی مستەر پیلینگتۆن لە لایەکەی تری هێجەکەدا ڕاوەستابوو، هەروەها منیش لەوێوە گەلێك دوور بووم، بەڵام لە ڕاستیدا ئەرخەیانم کە ئەمەم بینی- لەگەڵ تۆدا قسەی دەکردو تۆش دەتهێشت نەوازشی لمۆزت بکات. ئەوە چ مانایەك دەگەیەنێ مۆلّی؟".

"ئەو نەیدەکرد! من نەبووم! ئەمە ڕاست نیە" مۆلّی قیژاندیو بە دەوروبەردا کەوتە سمکۆڵکردنو سم بە عەرزەکەدا ماڵین.

"مۆلّی! تەماشای چڕوچاوەم بکە. ئایا گفتی شەرەفم دەدەیتێ کە ئەو پیاوە نەوازشی لمۆزی تۆی نەدەکرد؟"

"ئەمە ڕاست نیە!" مۆلّی دووپاتی کردەوە، وەلێ سەیری چڕوچاوەی کلۆڤەری نەکردو ساتی دوای ئەوەش کەوتە هەڵاتنو بەرەو نێو کێڵگەکە دای لە چوار ناڵە.

تێفکرینێك کلۆڤەری داگرتەوە. بەبێئەوەی هیچ شتێك بەوانی تر بڵێت چووە بەستنگاکەی مۆلّیو بە سمەکانی پووشو پەلاشەکانی هەلاوگێڕ کردەوە. لەژێر پووشو پەلاشەکەدا کەلەکەیەکی بچکۆلانەی کلۆقەندو چەندین دەستە شریتی ڕەنگ جیاجیا حەشار درابوون.

سێ ڕۆژ دوای ئەوە مۆلّی دیارنەما. هەتا چەند حەوتوویەك هیچ شتێك دەربارەی لە کوێ بوونی نەزانرا، ئەوسا کۆترەکان ڕاپۆرتیان دا کە لەلایەکەی دیکەی ویلّینگدۆندا بینی بوویان. لەمیانی شەفتەکانیدا[89] دۆگ کارتێکی[90]

---

Shaft . [89] : میلە یاخود تەوەرە. شتێك هاوسای شەفتی ئۆتۆمبێل.

تەرپۆشی بە سوورو ڕەش بۆیەکراودا بوو، کە لەبەردەم مەیخانەکەیدا ڕاوەستابوو. پیاوێکی قەڵەوی رووخسار- ئاڵ کە پانتۆڵێکی کورتی خانەخاناوی گەیتەرێکی[91] پۆشیبوو، هەر بە پابلیکەن[92]دەچوو، نەوازشی لمۆزی دەکردو قەندی دەرخوارد دەدا. تازە مووی کۆتەکەی[93] برابووەوەو شریتێکی سوریشی پۆشیبووە دەوری کاکۆڵی. وا دەردەکەوت کە خۆشگوزەرانی دەکرد. کۆترەکان ئاوایان گوت. هەرگیز دوای ئەوەی هیچ یەکێ لە ئاژەڵەکان جارێکی تر ناوی مۆڵیبیان نەهێنا.

لە مانگی ژەنیوەریدا[94] کەشوهەوایەکی قارسو تووش داهات. زەوی وەکو ئاسن وابوو. لە کێڵگەکانیشدا نەدەبوو هیچ شتێك ئەنجام بدرێت. چەندی کۆبوونەوە لە تەویلە گەورەکەدا بەستراو، بەرازەکان بە بەرنامەڕێژیی ئیشوکاری وەرزی داهاتووەوە خۆیان سەرقاڵ کردبوو. هاتبووە قبووڵکردنی ئەوەی کە بەرازەکان، بە ڕوونو ئاشکرایی لە ئاژەڵەکانی دی زرنگتر بوون، دەبوو بڕیار لەسەر سەرجەمی پرسەکانی سیاسەتی[95] مەزراکە بدەن. ئەگەرچیش بڕیارەکانیان دەبوو زۆرینە دەنگی لەسەر بدەنو بسەلمێنرێن. گەر لە سۆنگەی دەمەقاڵەکانی مابەینی سنۆبۆڵو ناپولیۆنەوە نەبووایە، ئەوا ئەم ڕێکەوتنە زۆر بەباشی کاری

---

Dog Cart . [90] : گالیسکەیەکی دوو چەرخییە، سەگ یاخود ئەسپێك ڕایدەکێشێت.

Gaiter . [91] : کالۆش. کەوشی تایبەت کە بە پێڵاوەوە هەڵدەکێشرێتە پێ.

Publican . [92] : ساحێبی مەیخانە. مەیخانەچی.

Coat . [93] : پۆشش، کەوڵ، فەروو، پێستە.

January . [94] : کانوونی دووەم، مانگی یەکەمی ساڵی زایینی.

Policy . [95] : بەرنامەی سیاسەتی داڕێژراوی هەمیشە پەیڕەوکراوو لەسەر ڕۆشتوو.

دەکرد. ئەم جووتە لە هەموو خاڵێکدا کە هاودژی شیاو بووایە هاودژ دەبوون. ئەگەر یەکێکیان پێشنیاری تۆو وەشاندنی جۆی لە ئەیکەریجێکی[96] گەورەتردا بکردایە, ئەوا ئەوی دیکە خاترجەم داوای ئەیکەریجەیەکی گەورەتری تۆوکردنی خرپووکی دەکردو ئەگەریش یەکێکیان ئەوەی وت کە کێڵگەیەکی ئاوا لەم بابەتە هەر بۆ کەلەرم گونجاو بوو، ئەوی تریان ئەوەی ڕادەگەیاند کە بۆ هەموو شتێك بێ کەڵك بوو هەر تەنها بۆ ڕووتس[97] نەبێت. هەریەکەیان پەیڕەوکەرانی خۆیان هەبوو، هەندێك دێباتەی توندوتیژیش لە ئارادا هەبوون. لە کۆبوونەوەکاندا زۆرجار سنۆبۆڵ بە گوتارە دانسقەکانی قەناعەتی زۆرینەی بەدەست دەهێنا، بەڵام ناپولیۆن لەوەدا باشتر بوو کە بەیناوبەین زەمینەی پشتیوانکردنی بۆ خۆی خۆش دەکرد. بەتایبەتیش لەگەڵ مەڕەکاندا سەرکەوتوو بوو. بەم دواییە مەڕەکان بەوەوە ڕاهاتبوون کە بە بارەبارِ (چوار قاچ باشە، دوو قاچ خراپە) یان لە هەردوو وادەو ناوادەی خۆیدا دەیانوت‌و زۆرجارش کۆبوونەوەیان بەمە تێکدەدا. تێبینی ئەوەکرابوو کە بەتایبەتی لە چرکەساتە چارەنووسسازەکانی گوتارەکانی سنۆبۆڵدا ئامادەن دەست بکەن بە وتنی (چوار قاچ باشە، دوو قاچ خراپە). سنۆبۆڵ لێتوێژینەوەیەکی وردو پوختی دەربارەی چەند ژمارەیەکی کۆنی (فارمەر ئاند

---

Acreage . [96] : پانتایی زەوی بەپێی ئەیکەر (acre) کە هەر ئەیکەرێك چوار هەزار مەتری دووجایە.

Roots . [97] : واتە هەموو ڕووەکێك کە ڕەگەکەی خواردەمەنی بێت، بە وێنە توور، گێزەر، چەوەندەر، شێلمو..هتد.

ستۆك بریدەر)[98] كە لە خانووی نێو مەزراكەدا دۆزیبوونیەوەو تژی بوون لە كۆمەڵە پلانێك بۆ داهێنانو پێشكەوتن بە مەعلانانە لەمەڕ ئاوەڕۆی- كێڵگەكان[99] عەمباری ئالف[100]و سلاگی بنچینەییەوە[101] ئاخاوتو بەرنامەیەكی ئالۆزیشی بۆ هەموو ئاژەڵان دانا هەتا پیسایییەكانیان ڕاستەوخۆ لەنێو كێڵگەكاندا ڕۆبكەن، هەموو ڕۆژێكیش لە جێگایەكی جیاوازدا ڕۆی بكەن هەتاكو ڕەنج و ڕەحمەتی بە كارتەژ[102] گواستنەوەی نەكێشن. ناپولیۆن خۆی هیچ بەرنامەیەكی تایبەتی بە خۆی بەرهەم نەهێنا، بەڵام بەهێمنییەوە ئەوەت وت كە سنۆبۆڵ هیچ دەستكەوتێكی نابێتو وێش دەچێت كە چاوەڕوانی فرسەتێك بێت, بەڵام لە هەر هەموو مشتومڕەكانیاندا هیچ یەكێكیان بە ئەندازەی ئەو دانەیان توندوتیژ نەبوو كە لەسەر ئاسیاوەكە بەرپا كرابوو.

لەنێو لەوەڕگا دووردرێژەكەدا، كە لە خانووبەرەكانی مەزراكەوە زۆر دوور نەبوو, تەپۆڵكەیەكی بچكۆلانە هەبوو كە بڵندترین خاڵی سەر مەزراكە بوو. دوای چاوگێڕانێك بە عەرزەكەدا سنۆبۆڵ ئەوەی ڕاگەیاند كە ئەمە ئائەو شوێنە لوواوەیە بۆ ئاسیاو كە دەبێ وا دروست بكرێ هەتا دینەمۆیەك بخاتە گەڕو هێزی

---

[98]. Farmerand stoek Breeder : گۆڤاری مەزراگەڕو پەروەردەكەری مەڕومالاَت.

[99]. Field-Drain

[100]. Silage

[101]. Basic Slag : بەرماوەی كانی تواوە كە بریتیە لە فۆسفات وەكو بەرهەمی لاوەكی لە بەرهەمهێنانی پۆڵادا پێكهاتووەو چەشنی پەینیش بەكارهێنراوە.

[102]. Cartage : گاری، عەرەبانەی شمەك گوێزینەوە.

ئەلەكتریكی بە مەزراكە بدات. ئەمە لە زستاندا بەستنگاكان ڕووناك و گەرم دەكاتەوەو هەروەها سێركیولەر سۆیەك[103]چاف- كەتەرێك[104] مانگێل- سلایسەرێك[105]و ئەلەكتریك میلكینگ مەشینێك[106]یش.

ئاژەڵەكان پێشتر هەرگیز لەبارەی هیچ یەكێ لەمانەوە هیچیان نەژنەفتبوو (چونكە مەزراكە مەزرایەكی كۆنە- شێواز بوو، هەر تەنهاش دەزگاو مەكینە هەرە سەرەتاییەكانی هەبوو)، بە سەرسووڕمانەوە گوێیان گرتبوو كاتێك كە سنۆبۆڵ كۆمەڵێك وێنەی سەرسوڕهێنەری ئەو مەكینانەی ئامادە كردبوو كە ئیشەكانی بۆ ئەنجام دەدان لە كاتی ئاسوودەییان لەنێو كێڵگەكاندا كەوتبوونە ڕامان, یاخود لەڕێی خوێندنەوەو وتووێژەوە ئاوازیان پێشخست. لە ماوەی چەند هەفتەیەكدا بەرنامەكانی دروستكردنی ئاسیاوەكەی سنۆبۆڵ بەتەواوەتی سەركەوتنیان وەچنگ كەوت. زیاتری لێكدانەوەی میكانیكیەكان[107] لە سێ كتێبەوە سەرچاوەیان گرت كە هینی مستەر جۆنز بوون- ئەنجامدانی هەزار شتی سوودبەخش دەربارەی خانووبەرە[108]هەموو پیاوێك بەنای خشتدانەری خۆیەتی[109]و كارەبا بۆ نەوكاران[110]. سنۆبۆڵ كەپرێكی لە قەبێڵی ژووری كارو موتالادا

□□□. Cirular-Saw : مشاری- بازنە سووڕ، یاخود مشاری بە خڕی سووڕاو.
□□□. Chaff- Cutter : مەكینەی قرتاندنی ئالف.
□□□. Mangel-Slier : مەكینەی پارچەكردنی گاچەوەنەر.
□□□. Eiectric milking machine : مەكینەی دۆشینی كارەبایی.
107. Mechanical details
108 . One thousand usrful thinds to do about the house
109. Every Man His own Bricklayer
110. Electricity For Beginners

بەکارهێنا کە پێشتر بۆ ئینکیوو بەیتەرەکان[111] بەکارهێنرابوو، عەرزێکی سافی تەختەیشی هەبوو بۆ وێنەکێشانو نەخشەکێشانیش گونجاو بوو. هەر جارە بۆ چەندین سەعات لەوێدا خەڵوەتی دەگرت بە کتێبەکانیەوە کە بە بەرد ئاوەڵاکرابوونەوەو بە پارچە تەباشیرێکەوە کە بە مەحکەمی لە مەعبێنی گرێی سمەکەیەوە گرتبووی، بە گورجو گۆڵی دەبزواو هاموشۆی دەکرد، هێڵ لەدوای هێڵ نەخشەی دەکێشاو نووزەیەکی کزی هەیەجانو خرۆشی دەهێنایە سەر زار. هێدی هێدی پلانەکان پەلوپۆیان هاویشتو بوونە کەڵەکەیەکی ئاڵۆزی کرەنك[112] و کۆگ وییل[113]و پتر لە نیوەی عەرزەکەی داپۆشیبۆوە، کە ئاژەڵەکانی دیکە پەیان بەوە برد کە بەتەواوەتی تێگەشتن بەدەرە, بەڵام گەلێك کاریگەرە, هەموویان لانی کەم رۆژی کەرەتێك دەهاتن تا بروانن نەخشە کێشراوەکانی سنۆبۆڵ. هەتا مریشکەکانو مراوییەکانیش بە وریاییەکی مەزنەوە هاتن نەبا بەسەر نیشانەکانی تەباشیرەکەدا هەنگاو بنێن. تەنها ناپولیۆن خۆی گۆشەگیر ڕاگرتبوو. هەر لە دەستپێکەوە خۆی لە دژی ئاسیاوەکە ڕاگەیاند. ڕۆژێك بەهەرحاڵ، چاوەڕوان نەکراو بۆ پشکنینی پلانەکان گەیشتە ئەوێ. بە سەنگینییەکەوە لە دەوروبەری کەپرەکەدا هەنگاوی هەڵدەنا، بەدیقەتەوە تەماشای گشت کێلدانەوەو وردەکارییەکی پلانەکانی کردو جارێك, یاخو دووجار

---

[111] . Incubators : دەزگای هەڵهێنانی هێلکە. کڕخەری دەستکرد.

[112] . Crank : دەستەی میحوەر. بازووی چەرخاندنن، یان سووڕاندنەوە. هندر.

[113] . Cog-Wheels : چەرخی دندانادار. دشلی.

بە میشەمیشەوە بۆنی پێوە کردن، ئەوساکە بۆ ماوەیەکی کەمخایەن ڕاوەستانو لە تیلەی چاویەوە ئەبڵەق لێیان ڕاما، ئینجا لەپڕدا قاچی هەڵبڕی، بەسەر پلانەکاندا میزی هەڵداو بەبێئەوەی وشەیەکیش دەربپەڕێنێت چووە دەرەوە. سەرانسەری مەزراکە زۆر بەتوندی لەسەر مەسەلەی ئاسیاوەکە دابەش ببوون. سنۆبۆڵ نکوولّی لەوە نەکرد کە بنیاتنانی دەبێتە پرسێکی دژوار. دەبووایە بەرد دەربهێنرێتو[114] بینای دیوارەکانی پێ بکرێن، ئەوسا دەبووایە سەیڵەکان[115] دروست بکرێنو دوای ئەوەش پێداویستو ئاتاج بە دینەمۆو[116] کێبڵ[117]دەبوو. (چۆن ئەمانە دەبوو فەراهەم بکرێت سنۆبۆڵ نەیدەدرکاند), بەڵام ئەوەی ڕاگەیاند کە تێکڕایی دەکرێ لە یەك ساڵدا ئەنجام بدرێت. دوای ئەوەش ڕوونی کردەوە دەکرێ ڕەنجێکی زۆریش بە هەدەر نەدرێت بەوەی کە ئاژەڵەکان لە هەفتەیەکدا تەنها پێویستیان بە سێ ڕۆژ ئیشکردن دەبێت. ناپولیۆن لە لایەکی ترەوە مشتومڕی ئەوەی دەکرد کە ئاتاجی مەزنی هەنووکە زیادکردنی بەرهەمهێنانی خۆراك بوو، ئەوەش کە ئەگەر وەخت بە ئاسیاوەکەوە بەفیڕۆ بدەن ئەوا هەموویان لە برساندا دەمرن. ئاژەڵەکان لەنێو دوو تاقمدا لەژێر دروشمی (دەنگ بدە بە

---

. Quarried : دەرکردنی بەرد لە کانی بەردین. کانی بەردین.

. Sails : دەزگای هەواگیریی بۆ ئاسیاو. ئەو زمانانەی بەهۆی هەواوە دەسووڕێنەوە.

. Dynamos : داینەمۆ، موەلیدە.

. Cables : کابلۆ، کێبڵ، وایەری ئەستووری بەرگەگری تەزووی کارەبا.

سنۆبۆڵو هەفتەی سێ- ڕۆژ ئیشکردن)و (دەنگ بدە بە ناپولیۆنو ئاخوڕی تێروتەسەل)دا خۆیان ڕێکخست.

بێنجامین تاقە ئاژەڵێك بوو کە لایەنی هیچ یەکێ لە تاقمەکانی نەگرت. ڕەتی کردەوە کە باوەڕ بەوە بهێنێ کە خۆراك زۆروزەبەندەتر دەبێت, یاخود ئەوەی کە ئاسیاوەکە پاشەکەوتی ئیشوکار دەکات. ئاسیاو هەبێت یاخود ئاسیاو نەبێت. وتی: "ژیان هەروەکو چۆن هەمیشە بەردەوام بووە بەردەوام دەبێت- بە گوزارەیەکی تر، بەشێوەیەکی خراپ".

لەو دەمەقاڵانە بترازێ کە لەسەر ئاسیاوەکە ئەنجام دەدران مەسەلەی بەرگریکردن لە مەزراکەش لەئارادا بوو. بەتەواوەتی درك بەوە کرابوو کە ئەگەرچیش ئادەمیزادەکان لە شەڕی کاوشێدەکەدا شکستیان خواردبوو ڕەنگە بە بڕیارێکی پتەوترەوە دەستپێشکەرییەکی تر بکەن بۆ دەستگیرکردنەوەی مەزراکەو جێگیرکردنەوەی مستەر جۆنز. هەموو لەوەش پتر هۆیان بۆ ئەنجامدانی ئەوە هەبوو, لەبەرئەوەی هەواڵی شکستخواردنیان لە سەرانسەری ئاواییەکەدا بڵاوبۆوەو ئاژەڵانی مەزرا دراوسێکانیان لە هەموو کاتێك زیاتر بێ سرەوت و نائارام کردبوو. وەکو عادەت سنۆبۆڵو ناپولیۆن لە ڕێکنەکەوتندا بوون, بەگوێرەی ناپولیۆن ئەوەی کە ئاژەڵەکان دەبووایە پێی هەڵبستن ئەوەبوو کە چەك[118]دەستگیر بکەنو خۆیان بەهۆی بەکارهێنانیانەوە ڕابهێنن. بەگوێرەی سنۆبۆڵیش دەبووایە زۆرترو زۆرتر کۆترەکان ڕەوانە بکەنو لەنێو ئاژەڵانی سەر

---

[illegible] چەك .

مەزراکانی تردا یاخیگەریی دنە بدەن. یەکێکیان مشتومڕی ئەوەی دەکرد کە ئەگەر نەتوانن بەرگریی لە خۆیان بکەن، ئەوا حەتمەن شکست دەخۆن، ئەوی دیکەیان دەمەقاڵەی ئەوەی دەکرد کە ئەگەر یاخیگەریی لە هەموو لایەکدا بەرپا بوو, ئەوا ئیدی ئاتاجیەو نابێت کە بەرگریی لە خۆیان بکەن. ئاژەڵەکان یەکەم گوێیان لە ناپولیۆن ڕادێرا، ئینجا گوێیان لە سنۆبۆڵ گرتو نەیانتوانی بڕیاری یەکجاریی لەسەر ئەوە بدەن کە کامەیان لەبار بوون, بەڵام بێگومان هەمیشە درکیان بەوە دەکرد کە لەگەڵ ئەوەی لەو ئانوساتەدا دەخاوت لە تەباییدا بوون.

سەرەنجام ئەو ڕۆژە هات کە پیلانەکانی سنۆبۆڵ کەماڵیان بەخۆوە گرت. لە کۆبوونەوەی یەکشەممەی داهاتوودا دەبووایە مەسەلەی ئەوەی کە ئاخۆ لە ئاسیاوەکەدا دەستبەکار بن یاخود نا، بخرێتە دەنگدانەوە. کاتێك کە ئاژەڵەکان لە تەویلە گەورەکەدا گردبوونەوە، سنۆبۆڵ هەستایە سەر پێ‌و سەرباری ئەوەش کە جاروبار لەلایەن بارەباری مەڕەکانەوە قسەی پێ دەبڕا، بەڵام هۆکارەکانی لایەنگیریکردنی خۆی لە بنیاتنانی ئاسیاوەکە ڕوونکردەوە، ئینجا ناپولیۆن بۆ بەرپەرچدانەوە هەستایە سەر پێ. زۆر بە هێوری ئەوەی وت کە ئاسیاوەکە بێ مانایەو ئامۆژگاری هیچ کەسێك ناکات هەتا دەنگی بۆ بداتو یەکسەر دووبارە دانیشتەوە، هەر تەنها بۆ سی چرکە ئاخاوتو تەقریبەن بەرابەر بەو کاریگەریەش کە دنەی دابوو کەمتەرخەم دەهاتە بەرچاو. بەرامبەر بەمە سنۆبۆڵ هەڵبەزییەوە سەر پێیەکانو بەسەر مەڕەکاندا قیژاندی، کە سەرلەنوێ دەستیان کردبووەوە بە

بارەبار، لەبەرخاتری ئاسیاوەکە تکایەکی سۆزدارییانەی دەستپێکرد. تا هەنووکە تەقریبەن ئاژەڵەکان لە دڵسۆزیاندا بە یەکسانی دابەش ببوون، وەلێ لە چرکەساتێکدا ڕەوانبێژییەکەی سنۆبۆڵ لەگەڵ خۆیدا ڕایماڵین، لە ڕستە بریق وباقدارەکاندا وێنەیەکی مەزرای ئاژەڵانی کێشا کە ڕەنگە وەکو ئەوەی لێبێت وەختێ کە زەحمەتکێشانی نەفرەتئەنگێز لەسەر پشتی ئاژەڵەکاندا لادەبرێت. ئێستا ئیدی وێناکردنو خەیاڵەکەی لە چاف- کەتەرەکان[119]و تێرنیپ- سلایسەرەکان[120]یش ئاودیوو تر ببووەوە.

ئەلەکتریك، سنۆبۆڵ وتی: "دەتوانێ مەکینەی- کۆمباینەکان، گاسنەکان، هارۆوکان[121]ڕۆڵەرەکان[122]و ڕیپەرەکان[123]و بایندەرەکان[124]، لەپاڵ ئەمانەشدا بۆ هەموو بەستنگایەك گلۆپی کارەبایی، ئاوی گەرمو ساردو هیتەری کارەبایی فەراهەم بکات." ئەو کاتەی قسەکردنەکەی بڕییەوە گومان هەڵنەگربوو کە دەنگدانەکە بەرەو چ لایەك دەڕۆشت, بەڵام ئالەم ساتەدا ناپولیۆن هەستایە سەر پێو بە لاچاوێکەوە تێڕوانینێکی عەجایەبانەی گرتە سنۆبۆڵ، دەنگی بڵندی

□□□ . Chaff cutter : مەکینەی بڕینەوەی ئالف.

□□□ . Turnip- slicers : شێلم پارچەکەر.

□□□ . Harrows : ئامرازێکە بۆ چاککردنو خۆشکردنی زەوی دوای کێلانی. چنگەکی سافکردنی زەوی. تەختە.

□□□ . Rpllers : باگردێن.

□□□ . Reapers : مەکینەی درەوکردن.

□□□ . Binders : ئامرازێکە هاوکات دروێنە دەکاتو دەسکەنەش دەکات.

جۆرە زارییەکی ئەوتۆی دەرپەڕاند کە هەرگیز هیچ کەسێك پێشتر نەیبیستبوو. لەم کاتەدا لە دەرەوەدا دەنگی حەپەحەپێکی وەحشەتناك دەهاتو نۆ دانە سەگی سامناك کە تەوقی بە بڕۆنز- ڕازاوە[125]یان پۆشیبوو بە پەلامارەوە چوونە نێو تەویلەکەوە. ڕاستەوڕاست بەرەو سنۆبۆڵ ڕایان کرد، کە سەرەنجام ڕێك لە شوێنەکەی خۆیەوە بازیدا هەتاکو لە شەویلاگە وتجرونجرکەرەکانیان هەڵبێت. لە یەك چرکەساتدا لە دەرەوەی دەرگاکەدا بوو ئەوانیش بە دوویەوە بوون. لەوە زیاتر سەرسامو تۆقیبوون کە بتوانن قسە بکەن، هەموو ئاژەڵەکان لەمیانەی دەرگاکەدا قەرەباڵخیان کردبوو هەتاکو تەماشای ڕاوەدوونانەکە بکەن. سنۆبۆڵ سەرانسەری ئەو پاوانە دووروودرێژەی تەی کرد کە بە جادەکە دەگەشتەوە. بەشێوەیەك ڕایدەکرد کە هەر بەراز پێیدەکرا وا ڕابکات، بەڵام سەگەکان لە پاژنەکانیەوە نزیك ببوونەوە. لەپڕێکا هەڵخلیسکاو وێدەچوو بێ چوونو چەرا زەفەریان پێی بردبێت.

دوای ئەوە دووبارە هەستایەوە، بەلەزتر لە هەمیشە ڕایدەکرد، ئینجا سەگەکان سەرلەنوێ پێی گەشتنەوە. یەکێکیان لەوانە تەقریبەن شەویلاگەکانی بەسەر کلکی سنۆبۆڵدا وێکهێنایەوە، بەڵام سنۆبۆڵ سەرەنجام ڕێك بە تەکانێکی توند ڕەهای کرد. ئەوسا گورێکی نوێی گرتە خۆو بەتەواوی لە چەند ئینجێکی زیادەدا لەمیانەی کونێکی نێو هێجەکەوە دانگەڕێژەی کردو جارێکی تر نەبینرایەوە.

---

125. Brass-studded collars : ئەو ملەوانە قایشییەی دەخرێتە ملی سەگەوە.

ماتو تۆقیوو، ئاژەڵەکان بە پێدزە چوونە نێو تەویلەکە. سەگەکان لە یەك ئاندا بە هەڵپەوە گەڕانەوە دواوە. سەرەتا هیچ کەسێك لە توانایدا نەبوو تا وێنای ئەوە بکات کە ئەم بوونەوەرانە لە کوێندەرێوە هاتبوون، وەلێ گیروگرفتەکە هەر زووبەزوو چارەسەر کرا. ئائەو تولەسەگانە بوون کە ناپولیۆن لە دایکیان دابڕیبوونو بەشێوەیەکی تایبەتمەندانە گۆشی کردبوون. ئەگەرچیش هێشتا تەواو گەورە نەببوون, بەڵام سەگ گەلێکی زلحۆرت بوونو گورگ ئاسا بە دڕندە دەچوون. لە نزیك ناپولیۆندا سەقامیان گرتبوو. تێبینی ئەوە کرابوو کە کلکیان بۆی دەلەقاند, هەر بەهەمان شێوە کە سەگەکانی تر ڕاهاتبوون بۆ مستەر جۆنز ئەنجامی بدەن. ناپۆلیۆن بە لایەنگیربوونی سەگەکانەوە بۆی، ئیدی چووە سەر ئەو بەشە بلّندکراوەی عەرزەکە کە پێشتر مەیجەر لە سەریدا ڕاوەستابوو هەتا گوتارەکەی خۆی پێشکەش بکات. ئەوەی ڕاگەیاند کە لە ئێستا بەدواوە کۆبوونەوەکانی سبەینانی- یەکشەممە کۆتاییان پێدێت, چونکە زەرووری نەبوونو وەختیان بەفیڕۆ دەدا، وای وت. لە ئایندەدا تێکڕای ئەو مەسەلانەی بە کارکردنی مەزراکەوە وابەستەن لەلایەن کۆمیتەیەکی تایبەتی بەرازەکانەوە بڕیاری لەسەر دەدرێت، کە لەلایەن خۆیەوە سەرپەرشتی دەکرێت، ئەمانە بە نهێنی کۆدەبنەوەو دوای ئەوە بڕیارەکانی خۆیان بەوانی دی ڕادەگەیەنن, وەلێ هێشتاش ئاژەڵەکان هەر دەبێ سبەینانی- یەکشەممە گرد ببنەوە بۆ درووودکردن لە ئاڵاو چڕینی گیانەوەرانی ئینگلستانو وەرگرتنی فەرمانەکانی ئەو هەفتەیەیان، بەڵام ئیدی گفتوگۆی تر لە ئارادا نابێت. وێڕای ئەو شۆکەش کە دەرپەڕاندنی سنۆبۆڵ پێی

بەخشین، ئاژەڵەکان بە ڕاگەیاندنی ئەمە سڵەمینەوە. چەند دانەیەکیان پرۆتێستۆیان دەکرد ئەگەر بیانتوانیبایە ئارگومێنتی بەجێ بدۆزنەوە. هەتا بۆکسەریش بە پێواریی نیگەران ببوو. گوێچکەکانی خۆی بەرەو پشتەوە ڕاکشاند، چەند جارێك پەرچەمی ڕاوەشاندو بە سەختییەوە هەوڵیدا بۆئەوەی ئەندێشەکانی خۆی ڕێکوپێك بخات، بەڵام ئاکام نەیتوانی بیر لە هیچ شتێك بکاتەوە بۆئەوەی بیڵێت. هەندێك لە بەرازەکان خۆشیان، بەهەرحاڵ زۆر بەئاشکرایی دەریانخست. چوار کودەڵەی نەوجەوان کە لە ڕیزی پێشەوەدا بوون کۆمەڵە قیژەیەکی دوورودرێژو تیژی نارەزاییان دەربڕیو هەر چواریان هەڵبەزینەوە سەر پێیەکانی خۆیانو پێکرا هاوکات دەستیان بە ئاخاوتن کرد, بەڵام ناگەهان سەگەکان کە لە زێواری ناپولیۆندا ڕۆنیشتبوون کۆمەڵە نەڕەیەکی توندوتیژی هەڕەشەئامێزیان بەرهەڵداو کردو بەرازەکان کەوتنە نێو خامۆشیو دووبارە دانیشتنەوە. ئەوسا مەڕەکان دەستیان کرد بەوەی کە بە بارەبارێکی نائاساییەوە (چوار قاچ باشە، دوو قاچ خراپە) بڵێن کە نزیکەی بۆ چارەکە سەعاتێك بەردەوامی بە خۆیەوە بینیو کۆتایشی بە هەموو فرسەتێکی گفتوگۆکردن هێنا.

دواتر سکویلەر بە هەموو لایەکی مەزراکەدا نێردرا بۆئەوەی تەرتیبدانو ڕێکخستنە تازەکان بۆ ئەوانی تر ڕاڤە بکاتەوە.

(هەڤالان) سکویلەر وتی: "لەو بڕوایەدام کە هەموو ئاژەڵێکی ئێرە پێزانینی هەبێ بۆ ئەو قوربانییەی هەڤاڵ ناپولیۆن داوێتی بەوەی کە ئەو زیادە هیلاكو

ماندوێتییه بگرێته خۆی. خەیاڵی ئەوە نەکەن هەڤاڵان، کە پشەوایی بەختەوەرییە. بەپێچەوانەوە بەرپرسیارێتییەکی دژوارو ئاڵۆزە. هیچ کەسێك پەیگیرتر لە هەڤاڵ ناپولیۆن باوەڕ بەوە ناکات کە هەموو ئاژەڵەکان هاوسانن. بەتەواوەتی خەنیو خۆشحاڵ دەبێت کە لێتان بگەڕێت تاکو بۆ خۆتان بڕیارەکانتان بدەن, بەڵام هەندێکجار ڕەنگە بڕیاری نادروست وەربگرن. هەڤاڵان ئەوساش لە کوێ دەبین؟ گریمان واتان بڕیار دا کە پەیڕەوی سنۆبۆڵ بکەن، لەگەڵ قسەی قۆڕی ئاسیاوەکانی- سنۆبۆڵ، کێیە ئەوەی کە ئاوا ئێستا دەیناسین؟ کە لە تاوانکارێك چاکتر نەبوو".

"لە شەڕی کاوشێدەکەدا بەجەرگانە شەڕی کرد" یەکێك وتی. "ئازایەتی تەنها بەس نیە" سکویلەر وتی. وەفاداریو گوێڕایەڵی زۆر گرنگترن, بەڵام لەبارەی شەڕی کاوشێدەکەش لەو باوەڕەدان ئیدی وەختی ئەوە بێت کە پەی بەوە بەرین کە بەشدارییەکەی سنۆبۆڵ تیایدا کەم و زۆر زیادەڕەوی بوو. دیسپلین، هەڤاڵان دیسپلینی ئاسنین! ئەمەیە دروشمی ئەمڕۆ. یەك شەقاونانی ساختەو نەیارەکانمان لەسەرماندا دەبن. بێگومان هەڤاڵان گەڕانەوەی جۆنزتان ناوێت؟".

جارێکی تریش ئەم مشتومڕە وەڵام هەڵنەگر بوو، بێگومان ئاژەڵەکان نەیاندەویست جۆنز بگەڕێتەوە، ئەگەر بەستنی دێباتەکان لەمەڕ سبەینانی- یەکشەممەوە دەبوونە بەرپرسی ئەوەی کە ئەو بهێننەوە، ئەوا پێویستە دێباتەکان ڕابگیرێن. بۆکسەر کە ئێستاکە وەختی ئەوەی هەبوو هەتا وردەکارانەتر لە شتەکان تێفکرێت، گوزارەی لە بۆچوونی گشتی کرد بە وتنی: "ئەگەر هەڤاڵ

ناپولیۆن ئەوە بڵێت، ئەوا دەبێت ڕاست بێت" لەوساوەش وێڕای دروشمە تایبەتیەکەی خۆی کە "من سەختتر کاردەکەم" بوو پەندی "ناپولیۆن هەمیشە لەسەر هەقە"ی وەخۆوە گرت.

لەم کاتەدا کەش وبا گۆڕانێکی کتوپڕی بەخۆوە دیتو کێڵانی بەخارەش دەستی پێکرد. ئەو کەپرەی کە سنۆبۆڵ پیلانەکانی ئاسیاوەکەی خۆی تیادا کێشابوو داخرابوو, واش دانرا کە پیلانەکان لەسەر زەویەکەدا سڕابوونەوە. هەموو سبەینانی یەکشەممەیەك لە سەعات دەدا ئاژەڵەکان لە تەویلە گەورەکەدا کۆدەبوونە هەتا بۆ هەفتەکە فەرمانەکانیان وەربگرن. کەللە سەرەکەی مەیجەری پیر، کە ئێستاکە لە گۆشت داماڵرابوو لە باخەکە لە گڵکۆی خۆی وەدەرهێنراو لەسەر بنەکۆتەرەی دارێکدا لەلای پایەی دارئاڵاکەوە لە تەنیشت تفەنگەکە بە مەحکەمیی دانرا. پاش هەڵدانی ئاڵاکە ئاژەڵەکان داوایان لێکرابوو کە بەر لەوەی بچنە نێو تەویلەکەوە ڕیزی بگرنو بە ڕەفتارێکی ڕێزدارانەوە بە لای کەللە سەرەکەدا گوزەر بکەن. ئەم ڕۆژانە هەموو پێکەوە دانەدەنیشتن وەکو ئەوەی کە لە ڕابردوودا دەیانکرد.

ناپولیۆن لەگەڵ سکویلەرو بەرازێکی تر بەناوی مینیمەس[126] کە بەهرەیەکی سەرنجڕاکشی بۆ شیعرو گۆرانی دانان هەبوو دانیشتوو لەسەر لێواری سەکۆ بەرزکراوەکە، لەگەڵ نۆ دانە سەگە نەوجەوانەکان کە نیمچە بازنەیەکیان بە دەوروبەردا بەرپا کردبوو. بەرازەکانی دیکەش لە پشتەوەدا دانیشتبوون. ناپولیۆن

---

126. Minimus.

بە شێوازێکی سەربازییانەی بە زەبروزەنگ فەرمانەکانی هەفتەکەی خوێندەوەو پاش یەکجار چڕینی گیانەوەرانی ئینگلستان هەموو ئاژەڵەکان بڵاوەیان لێکرد. سێیەم یەکشەممەی پاش دەرپەڕاندنی سنۆبۆڵ، ئاژەڵەکان تا ئەندازەیەك سەریان سوورمابوو کە لەئاکامدا ببیستن ناپولیۆن ئەوە ڕابگەیەنێت کە دەبێ ئاسیاوەکە دروست بکرێت. لە بەرامبەر گۆڕینی بۆچوونەکەی خۆیدا هیچ هۆیەکی دەرنەخست، بەڵام هەر تەنها ئاگاداری ئاژەڵەکانی کردەوە کە ئەم ئەرکە ئیزافیە ئیشێکی دژوار دەگەیەنێت، هەتا دەشێ کەمکرنەوەی ئازووخەکانیشیان زەرووری بێت. پیلانەکان بەهەرحاڵ تەواو هەتا ئاخرین ڕاڤەو لێکدانەوە، سەرجەم ئامادە کرابوون, کۆمیتەی تایبەتی بەرازەکانیش لەم سێ هەفتەیەی ڕابردوودا لە ئیشەکاندا بە سەریانەوە بوون. بنیاتنانی ئاسیاوەکە، لەگەڵ چەندین ئاوەدانکردنەوەو چاکسازی جۆراوجۆر، پێشبینی ئەوە کرابوو کە دوو ساڵ بخایەنێت. ئەو ئێوارەیە سکویلەر بەشێوەیەکی تایبەتی بۆ ئاژەڵەکانی تری شرۆڤە کردەوە کە لە ڕاستیدا ناپولیۆن هەرگیز دژی ئاسیاوەکە نەبوو، بەپێچەوانەوە ئەوە ئەو بوو کە هەر لە نۆژەنەوە لایەنگیریی بوو، ئەو پلانەش کە سنۆبۆڵ لەسەر عەرزەی ئینکیوو بەیتەرەکەدا کشابووی لە هەقیقەتدا لەمیان کاغەزەکانی ناپولیۆنەوە دزرابوون. ئاسیاوەکە لە ڕاستیدا داهێنانی خودی ناپولیۆن خۆی بوو. ئەی ئیتر بۆچی یەکێك پرسی، ئەمەندە بە توندوتیژییەوە لە دژیدا قسەی کردبوو؟ ئالێرەدا سکویلەر زۆر فریودەرانە بەدیار کەوت. ئەوە وتی، سەلیقەی هەڤاڵ ناپولیۆن بوو. وای بەدیار خستبوو کە دژی ئاسیاوەکەیە، بە سانایی وەکو

مەشقێك بوو بۆئەوەی سنۆبۆڵ لە كۆڵ بكاتەوە كە كاراكتەرێكی خەتەرناك‌و كارتێكەرێكی خەراپ بوو. ئێستاكە ئیدی سنۆبۆڵ لە ڕێگاكەیان دووركەوتبۆوە پیلانەكە دەكرا بەبێ خۆتێهەڵقورتاندنی ئەو بەرەو پێشەوە بچێت. ئەمە سكویلەر گوتی شتێك بوو پێی دەوترا تاكتیك. چەند جارێك دووپاتی كردەوە (تاكتیك، هەڤاڵان، تاكتیك) بەملاو بەولادا هەڵدەبەزییەوەو بە پێكەنینێكی شادمانانەوە كلكی ڕادەوەشاند. ئاژەڵەكان دڵنیانەبوون كە وشەكە چی دەگەیەنێت، بەڵام سكویلەر گەلێك قایلكەرانە ئاخاوت‌و ئەو سێ سەگەش كە وا ڕێكەوت لەگەڵیدا بن زۆر بە هەڕەشەئامێزانەوە نەڕاندیان، هەتاوەكو بەبێ پرسیارگەلێكی زیاترەوە ڕاڤەكارییەكانی ئەویان قبووڵ كرد.

# بەشی شەشەم

ئاژەڵەکان بەدرێژایی ئەو ساڵە سایلی کۆیلە کاریان کرد, بەڵام لە کارکردنی خۆیان دڵخۆش بوون، لە هیچ کۆشش, یاخود خۆبەختکردنێکدا بێ مەیلییان پشان نەدا، زۆر بەچاکی ئاگاداری ئەوە بوون کە هەرچی شتێك کە ئەنجامیان دابوو لەپێناوی خێروبێری خۆیانو ئەوانەدا بوو کە لە جۆرو نەژادی خۆیان بوون کە لەپاش خۆیاندا دەهاتن، نەك بۆ گەلە ئادەمیزادێکی دزو تەمبەڵ.

بەدرێژایی بەهارو هاوین هەفتەی شەست سەعات کاریان کردو لە ئۆگستۆسدا ناپولیۆن ئەوەی ڕاگەیاند کە لە دوانیوەڕۆی یەکشەممەکانیش دەبێ هەروەها ئیش بکرێت. ئەم ئیشە موتڵەقەن خۆبەخشانە بوو، بەڵام هەر ئاژەڵێك کە خۆی لێرە دزییەوە ئازووخەکەی بۆ نیو کەم دەکرایەوە. لەگەڵ ئەوەشدا پەی بەوە برا کە پێویست بوو هەندێك لە ئەرکەکان بە جێبەجێ نەکراوی وازی لێ بهێنرێت. دروێنەکردن لە هینەکەی ساڵی پێشووتر نەختێك کەمتر سەرکەوتوو

بوو. ئەو دوو کێڵگەیەش کە لە سەرەتای هاویندا دەبووایە بە ڕووتس تۆو بکرێن تۆو نەکرابوون, چونکە هێند زوو کێڵان تەواو نەببوو. لەباریش بوو پێشبینی ئەوە بکرێت کە زستانی داهاتوو دەبێتە زستانێکی سەختو تووش.

ئاسیاوەکە کێشەو گرفتی چاوەڕوان نەکراوی خستەڕوو. لەسەر مەزراکەدا کوارییەکی چاکی بەردەقسڵ هەبوو، لمو چیمەنتۆیەکی زۆروزەبەند لە یەکێك لە خانووەکانی دەرەوەدا دۆزرابوونەوە، تارادەیەك هەموو کەرەستەکانی بیناکردن لەبەردەستدا بوون, بەڵام ئەو کێشەیەی ئاژەڵەکان لە سەرەتادا نەیانتوانی چارەسەری بکەن ئەوە بوو کە چۆن بەردەکان بشکێننو بیکەن بە پارچەی قەبارە گونجاو, وەکو بلێی لە قوڵنگو نوێڵ بەولاوە بۆ ئەنجامدانی ئەمە هیچ ڕێگایەکی تر نەبوو. هیچ ئاژەڵێکیش نەیدەتوانی بەکاریان بەرێت, چونکە هیچ ئاژەڵێك نەیدەتوانی لەسەر پێیەکانی دواوەی ڕابوەستێت. تەنها دوای هەوڵو تەقەلای بێ هوودەی چەندین هەفتەدا بوو کە بیرۆکەیەکی شیاو بە هزری یەکێکدا ختوورەی کرد- کە ئەویش بە گوزارەیەکی دیکە، بەکارهێنانی هێزی کێشکردنی زەمین بوو. کۆمەڵێ تاتەبەردی زەبەلاح لەوە گەورەتر بوون کە هەروەکو خۆیان بەکاربهێنرێن، لە هەموو لایەکی بناغەی کوارییەکەدا کەوتبوون. ئاژەڵەکان گوریسیان بە دەوری گابەردەکاندا بەستەوەو ئینجا هەر هەموویان پێکرا مانگاکان، ئەسپەکان، مەڕەکان، هەر ئاژەڵێکیش کە دەیتوانی گوریسەکە بگریت- هەتا بەرازەکانیش هەندێکجار لە چرکەساتە قەیراناوییەکاندا بەشداریان دەکرد- بەهێواشییەکی نائومێدانەوە بەرەو سەرەو ژوورییەکەی بۆ سەر هەورازی

کوارییەکە ڕایان دەکێشا، کە ئالەو لێوارەوە تلۆر دەکرایە خوارەوە، هەتا لە خوارەوەدا ببنە کۆمەڵە پارچەیەکی وردوخاش. گوێزانەوەی بەردەکەش کاتێك کە ئیتر شکابوو تارادەیەك سانا بوو. ئەسپەکان لەنێو درشکەی بارگوازەرەوەدا دەیان برد، مەڕەکان دانە بەردیان بەکێش دەکرد، هەتا میوریەڵو بێنجامینیش خۆیان لەنێو گالیسکەی- دایەنەکەدا[127] نیر کردو بەشی خۆیان کاریان بەئەنجام گەیاند.

لە ئاخرو ئۆخری هاویندا بە ئەندازەیەکی باش زەخیرەی بەرد کەڵەکە ببوو، ئەوسا لەژێر سەرپەرشتی بەرازەکاندا بنیاتنان دەستی پێکرد, بەڵام پرۆسەیەکی لەسەرەخۆو دژوار بوو. پەیدەریەیش هەوڵو تەقەلای تاقەتبڕی سەرتاپای ڕۆژێکی پێ دەبرد هەتاکو تاقە گابەردێك بۆ سەرەوەی هەورازی کوواییەکە بەکێش بکەنو هەندێکجاریش کە بۆ خوارەوەی لێوارەکە پاڵدەنرا نەدەشکا. هیچ شتێکیش بەبێ بۆکسەر بەئەنجام نەدەگەشت، کە بەوە دەچوو هێزو توانای بەهێزو توانای لێکدراوی هەموو ئاژەڵەکانی تر یەکسان بێت. کاتێك کە گابەردەکە دەستی دەکرد بە خلبووەوەو ئاژەڵەکانیش کە پەیان بە خۆیان دەبرد بەرەو خوارەوەی تەپۆلکەکە ڕاپێچ کراون لە ناچاریدا دەکەوتنە قیژەو هاوار، هەمیشە بۆکسەر بوو کە کۆششی سەختی دژی گوریسەکە دەکردو گابەردەکەی دەهێنایە وەستان. بە بینینی ئەوەی کە ئینج بە ئینج مەینەتی سەرەوژوور کەوتنەکەی دەکێشا هەناسەی خێراتر دەدا، نوکی سمەکانی لە عەرزەکە گیردەبوونو تەنیشتە مەزنەکان خووناو دایدەگرتنەوە، هەموو کەسێکی لە سەرسامی کەیل دەکرد.

---

Governess -cart .[127]

کلۆڤەر هەندێکجار ئاگاداری دەکردەوە هەتا بەدیقەت بێت نەبا خۆی لە ڕادەبەدەر شەکەت بکات، بەڵام بۆکسەر هەرگیز گوێی لێنەدەگرت. دوودانە دروشمەکانی (من سەختتر کاردەکەم)و (ناپولیۆن هەمیشە لەسەر هەقە) وێدەچوو کە بۆ هەموو کێشمەکێشەکان وەڵامێکی پڕ بە پێست بن. لەگەڵ کەڵەشێرۆچکەکەدا ڕێکەوتننامەیان بەستبوو کە بەیانیان لەبری نیو سەعات پێشتر سێ چارەکە سەعات زووتر هەڵی بستێنی. لە چرکەساتە زیادەکانی خۆشیدا لەبارەی ئاپەوانەوە کە لەم ڕۆژانەدا زۆر نەبوون، بە تەنیا بۆ کوارییەکە دەڕۆشت، بارێك بەردی شکاوی کۆدەکردەوەو بەبێ کۆمەك بەرەو خوارێ بۆ جێگای ئاسیاوەکە ڕایدەکێشا.

ئاژەڵەکان بەدرێژایی ئەو تاوستانە سەرباری سەختی ئیشەکەشیان باریان زۆر خراپ نەبوو. ئەگەر خۆراکیان لەوەی لە ڕۆژانی جۆنزدا هەیانبوو زیاتریش نەبووایە، ئەوا لانی کەم لەوە کەمتریان نەبوو. سوودبەخشی ئەوەی کە تەنها بۆ خۆیان خۆراك فەراهەم بکەنو پێویستیش نەکات کە پشتیوانی پێنج ئادەمیزادی سەنگین خەرج بکەن، هێندە نایاب بوو کە گەلێك نوشوستیان هەڵدەگرت بۆئەوەی بایەخدارتر بن. میتۆدی ئەنجامدانی شتەکانی ئاژەڵانیش لە چەندین لاوە چالاکتر بوونو هێزی کاریان پاشەکەوت دەکرد. لەو جۆرە ئیشانەی وەکو ڕنینەوەی گژوگیای زیانبەخش، بۆ نموونە دەکرێ بە دیقەتێکی ئەوتۆوە ئەنجام بدرێت کە بۆ ئادەمیزاد مەحاڵ بێت. جارێکی تریش لەبەرئەوەی کە ئێستا ئیدی هیچ ئاژەڵێك دزی نەدەکرد. پێویستی نەدەکرد لەوەڕگاکە لە زەوی کشتوکاڵکراو پەرژین بکرێت، کە ئەوەش لە

پارێزگاریکردن لە هێجەکانو دەروازەکان هێزی کارێکی فرەی پاشەکەوت دەکرد. لەگەڵ ئەوەشدا کە هاوین بەسەرچوو چەندین جۆر کەموکوڕیی پێشبینی نەکراو کەوتنەخۆ دەرخستن هەتا هەستیان پێ بکرێت. لەوانە پێداویستی بە نەوتی پارافین[128]، بزمار، گوریس، پسکیتی سەگو ئاسنیش هەبوو بۆ ناڵی ئەسپەکان، کە هیچ یەکێ لەمانە نەدەبوو لەسەر مەزراکەدا بەرهەم بهێنرێن. هەروەها دواتریش پێداویستی بە تۆو و پەینی دەستکردو ئامرازی جۆربەجۆرو سەرەڕای ئەمانەش بە مەکینەکانی ئاسیاوەکە دەبوو. چۆن دەبوو ئەمانە دەستگیر بکرابان هیچ کەسێك توانای وێناکردنی نەبوو.

بەیانی یەکشەممەیەك کاتێك کە ئاژەڵەکان کۆبوونەوە بۆ وەرگرتنی فەرمانەکانیان ناپولیۆن ئەوەی ڕاگەیاند کە بڕیاری لەسەر سیاسەتێکی تازە داوە. لە ئێستا بەدواوە مەزرای ئاژەڵان لەگەڵ مەزرای دراوسێکاندا سەرقاڵی ساتوسەودا دەبێت. بێگومان کە بۆ هیچ مەبەستێکی بازرگانی, بەڵکە بە سادەیی لەپێناوی وەدەستهێنانی هەندێك کەرەستە کە بە پێداگرییەوە پێویستن. دەرخواستەکانی ئاسیاوەکەش پێویستە هەموو شتێکی دیکە پێشێل بکات. وتی لەبەرئەوە دەکەوێتە خۆتەیارکردن بۆ فرۆشتنی کەڵەکەیەك پووشو پەڵاشو بەشێك لە بەروبوومی گەنمی هەمان ساڵو پاشتریش ئەگەر پارەیەکی زۆرتر پێویست بوو، دەبێ لە ڕێگای فرۆشتنی هێلکەوە کۆبکرێتەوە، کە سەرومڕ لە ویلینگدۆندا بازاڕ بۆ هەموو مریشکەکان هەبوو. ناپولیۆن وتی: "دەبێ وەکو

---

[128] paraffin oil.

بەخششی تایبەتی خودی خۆیان لەپێناوی بنیاتنانی ئاسیاوەکە پشوازی لەم قوربانییە بکەن".

دیسانەوە ئاژەڵەکان لەبارەی ناڕەحەتییەکی پێوارەوە وەئاگا بوون. نابێ هەرگیز لەگەڵ ئادەمیزاددا هیچ ئاڵوویرێك بکرێت، نابێ قەتاوقەت لەگەڵیاندا خەریکی ساتوسەودا بن، نابێ هەرگیز کەڵك لە پارە وەربگیرێت- ئەمانە لە مابێنی ئەو بڕیارە سەرەتاییانەدا نەبوون کە لەو کۆبوونەوە سەرفرازانەیەی دوای دەرکردنی جۆنز بەستراو بوو بڕیاریان لەسەر درا؟ هەموو ئاژەڵەکان بە بڕیاردان لەسەر ئەو تەرزە بڕیارانەیان وەبیر دەهاتەوە, یاخود لانی کەم وای بۆ چوون کە وەبیریان دەهاتەوە. ئەو چوار بەرازە تولاّزەی کاتێ کە ناپولیۆن کۆبوونەوەکانی هەڵوەشاندەوە پڕۆتێستۆیان کردبوو ترسنۆکانە دەنگی خۆیان هەڵبڕی، بەلاّم دەستبەجێ لەلایەن نەڕەی نائاسایی سەگەکانەوە خامۆش کرانەوە. دواسا وەکو هەمیشە مەڕەکان دەستیان کردەوە بە وتنی (چوار قاچ باشە، دوو قاچ خراپە)و ئەو پەشۆکانە کاتیەش دووبارە ئارام بۆوەو ئاکام ناپولیۆن سمەکەی بۆ بێ دەنگکردنەوە هەڵبڕیو ئەوەی ڕاگەیاند کە پێشتر بە هەموو ئامادەکارییەکان هەستابوو. پێویستی بەوەش نەدەکرد هیچ یەکێ لە ئاژەڵەکان بەرخورد لەگەڵ ئادەمیزادەکاندا بکات، چونکە ئەوە بەئاشکرایی دەبووە پەسەند نەکراوترین شت. بەتەمای ئەوەش بوو کە سەرجەمی بەرپرسیارێتی بگرێتە سەرشانی خۆی. مستەر (وایمپەر)[129] پارێزەرێك بوو لە ویلینگدۆندا دەژیا، ڕازی بوو کە وەکو نێوەندچییەك لەمیان مەزرای

Mr. Whyper .[129]

ئاژەڵانو دونیای دەرەوەدا کار بکاتو هەموو سەرلەبەیانی دوو شەممەیەك بۆ قۆزتنەوەی ڕێنماییەکانی سەردانی مەزراکە بکات. ناپولیۆن وەك هەمیشە بە هاواری (هەر بژی مەزرای ئاژەڵان) دوایی بە گوتارەکەی خۆی هێناو دوای چڕینی گیانەوەرانی ئینگلستانیش ئاژەڵەکان بەڕێ خران.

پاشان سکویلەر گەشتێکی بە مەزراکەدا کردو بیرو خەیاڵی ئاژەڵەکانی خستە خاترجەمیەوە. لەوە ئەرخەیانی کردن کە بڕیار لە دژی خەریکبوون بە ساتوسەوداو بەکارهێنانی پارە هەرگیز نەدرابوو، یاخود پێشنیاریش هەر نەکرابوو, تەنها خەیاڵێکی بێ خەوش بوو، ڕەنگە هەر لە سەرەتاوە بگەڕێتەوە بۆ ئەو درۆیانەی کە لەلایەن سنۆبۆڵەوە بلاَودەکرانەوە. چەند ئاژەڵێك هێشتاش هەستیان بە بەدگومانییەکی لاواز کرد، بەڵام سکویلەر بە زرنگییەکەوە لێیپرسین "ئایا ئێوە دڵنیان لەوەی کە ئەمە شتێك نیە کە ئێوە خەونتان پێوە بینیبێت، هەڤاڵان؟ ئایا هیچ ڕیکۆردێکتان[130] لەبارەی بڕیاری لەو جۆرەوە هەیە؟ ئایا لە هیچ شوێنێکدا نووسراوەتەوە؟" بێگومان بەگوێرەی ئەو ڕاستیەی کە هیچ شتێکی لەو بابەتە بە نووسین بوونی نەبوو، ئاژەڵەکان بەوە ڕازی بوون کە بە هەڵەدا چووبوون.

هەموو دوو شەممەیەك مستەر وایمپەر هەروەکو چۆن تەرتیبکاری کرابوو سەردانی مەزراکەی دەکرد. پیاوێکی چکۆلانەی لاجانگداری بە فێڵباز- چوو

---

[130] Record : نووسینو یاداشتکردنی شتە گرنگەکان. نووسینو پاراستن وەکو بەڵگەنامە.

بوو، پاریزەری ڕێگایەکی زۆر بچووکی کاسبکاریی[131]بوو، بەڵام بە ئەندازەیەك بیرتیژ بوو کە بەر لە هەموو کەسێکی تر فامی بەوە دەکرد کە مەزرای ئاژەڵان پێداویستی بە دەلاڵ[132] دەبێتو دەلاڵییەکانیش ئەوەیان دەهێنا کە بقۆزرێنەوە. ئاژەڵەکان بە جۆرە سلێکەوە چاودێری هاتوچۆکردنیان دەکردو هێندەش کە مومکین بووایە خۆیان لێی دوورەپەرێز دەگرت. سەرباری ئەمەش بینینی ناپولیۆن لەسەر هەر چوار قاچدا فەرمانەکانی بە وایمپەر ڕادەگەیاند، کە لەسەر دوو قاچدا ڕاوەستا بوو، شانازییانی وروژاندو تاڕادەیەك لەگەڵ ڕێککەوتنە تازەکاندا ئاشتی پێبەخشین، ئێستا ئیدی پەیوەندییان لەگەڵ نەژادی ئادەمیزاددا بەتەواوی لێکچووی ئەوەی پشتووتر نەبوو. ئادەمیزادەکان هیچ لەوە کەمتر ڕقیان لە مەزرای ئاژەڵان نەبوو، بەتایبەتیش ئێستاکە بوژابووەوە، بێگومان زیاتر لە هەموو کاتێك ڕقیان لێی بوو، هەموو ئادەمیزادێك وەکو بەشێك لە ئیمانی لەو بڕوایەدا بوو کە مەزراکە زوو یاخود درەنگ قرخن دەردەچێتو لە هەمووشی گرنگتر ئەوەیە کە ئاسیاوەکە دەبێتە نوشوستی. لە مەیخانەکاندا کۆدەبنەوەو بەهۆی دایە گرامەکانەوە[133] بۆ یەکتری ئەوە دەسەلمێنن کە ئاسیاوەکە هەر دەبێ بڕوخێت، یاخود ئەوەی کە ئەگەر ڕاشوەستا، ئەوا هەرگیز ناکەوێتە کار. سەرەڕای ئەوەش پێچەوانەی خواستی خۆیان بەرامبەر بەو چالاکییەی کە پێ بە

---

131. Business : کاروباری بازرگانی، کاسبکاری.
132. Broker : نێوەندچی، دەلاڵ.
133. Diagram : ڕەسمی هێلکاری، خەتی بەیانی.

پێی ئاژەڵەکان کۆنترۆڵی کاروبارەکانی خۆیانیان دەکرد. هەندێك ڕێزو نەوازشیان پەیداکردبوو. یەکێك لە نیشانەکانی ئەمە ئەوە بوو کە دەستیان کردبوو بە ناوبردنی مەزرای ئاژەڵان بە ناوە دروستەکەی خۆیو لەوەش وازیان هێنابوو کە وا دەربخەن ناوی مەزرای مانەرە، هەروەها لە پشتیوانییەکەی خۆیان بۆ جۆنز پاشگەز ببونەوە، کە دەستی لە ئومێدی گێڕانەوەی مەزراکەی خۆی هەڵگرتبوو ڕۆشتبوو بۆئەوەی لە بەشێکی تری شارۆچکەکەدا هەڵبکات. بێجگە لە ڕێی وایمپەر هێشتاکە لەنێوان مەزرای ئاژەڵانو دونیای دەرەوەدا پەیوەندی بەرقەرار نەبوو، بەڵام بەردەوام بەندوباوی ئەوە هەبوو کە ناپولیۆن خەریکی ئەوە بوو یان لەگەڵ مستەر پیلینگتۆنی فۆکس وددا, یاخود لەگەڵ مستەر فرێدریکی پینچ فیلّدرا دەچووە ناو ڕێکەوتننامەیەکی بێ چوونو چەرای کاسبکاریەوە, بەڵام هەرگیز تێبینی ئەوە نەکرابوو کە هاوکات لەگەڵ هەردووکیاندا بێت.

لە دەوربەری ئەم کاتانەدا بوو کە بەرازەکان لەپڕێکا گواستیانەوە بۆ ناو خانووی نێو مەزراکەو لەوێدا جێ سەقامی خۆیان گرت. دووبارە بەوە دەچوو کە ئاژەڵەکان وەبیریان هاتبێتەوە کە لە ڕۆژانی سەرەتادا قەرارێك لە دژی ئەمەدا درابوو، دیسانەوە سکویلەر توانیبووی قایلیان بکات کە ئەمە هەقیقەتەکە نەبوو. بێ چوونو چەرا پێداگر بوو، کوتی، کە بەرازەکان، ئەوانەی کە ئاوەزی مەزراکە بوون دەبووایە شوێنێکی هێمنیان هەبێت بۆئەوەی ئیشی تێدا بکەن، هەروەها گونجاوتر بوو بەرامبەر بە ویقاری پێشەوا (چونکی لەو دواییانەدا وا خۆی ڕاهێنابوو کە لەژێر نازناوی (پێشەوا)دا دەربارەی ناپولیۆن بدوێت هەتا لە

خانوویەکدا بژی نەك لە گەڕەکێکی هاکەزاییدا. سەرباری ئەمانەش هەندێك لە ئاژەڵەکان چەواشە بوون کە بیستیان بەرازەکان نەکردووە بە ژووری تەفریحو سەرگەرمی، بەڵکو ئەئاوا لەنێو پێخەفەکانیشدا خەوتوون. بۆکسەر هەردەم بە وتنی (ناپولیۆن هەمیشە لەسەر هەقە) خۆی دزیەوە، بەڵام کلۆڤەر، کە وای بۆ چووبوو حوکمێکی بێ چوونو چەرای لە دژی پێخەفەکان دەهاتەوە بیر، هەتا ئاخری تەویلەکە ڕۆشتو تەقەلایدا حەوت ڕاسپاردەکان لێك بداتەوە کە لەوێدا ڕوونووس کرابوون. کە پەی بە خۆی برد لە توانایدا نیە لە هەندێ پیتی تاکڕەوانە بەولاوە چیدی بخوێنێتەوە، چوو میوریەڵی هێنا.

"میوریەڵ" کلۆڤەر وتی: "چوارەمین ڕاسپاردەم بۆ بخوێنەرەوە. ئایا شتێك لەبارەی هەرگیز نەخەوتن لەناو پێخەفدا نالێت؟"

میوریەڵ بە هەندێك سەختییەوە کەوتە ڕوونکردنەوەی.. "دەڵێت هیچ ئاژەڵێك نابێ لەنێو پێخەفێکی چەرچەفداردا بخەوێت"، لە ئاکامدا ڕایگەیاند تا ئەندازەیەك لاپڕەسەن ببوو، کلۆڤەر ئەوەی بیر نەدەهاتەوە کە چوارەم ڕاسپاردە پەنجەنومای بۆ چەرچەف کردبێت، بەڵام لەبەرئەوەی لەوێ لەسەر دیوارەکەدا بوو، ئەوا دەبوو هەروا بووبێت. سکویلەریش کەوا ڕێکەوت لەو ساتەدا بەوێدا تێپەڕێت، دوو یاخود سێ سەگی لەگەڵدا بوو، توانیبووی تێکڕای کێشەکە بخاتە نێو دیدی دروستی کێشەکە خۆیەوە.

"کەواتە بیستتان، هەڤاڵان" سکویلەر وتی "کە ئێمەی بەراز ئێستا ئیدی لەناو پێخەوەکانی خانووی نێو مەزراکە دەخەوین؟ ئەی بۆ نا؟" بێگومان لەو

باوەڕەدا نەبوون کە هەرگیز لە دژی پێخەودا بڕیار درابێت؟ پێخەف تەنها شوێنێك بۆ خەوتن دەگەیەنێتو هیچی تر. کەڵەکەیەك پووشو پەڵاش لە بەستنگادا پێخەفە، وەکو پێویستیشە تەماشای دەکرێت. قەرارەکە لە دژی چەرچەف درابوو کە داهێنراوی ئادەمیزادە. چەرچەفەکانمان لە پێخەفەکانی خانووی نێو مەزراکەدا داماڵیوەو لەمیان بەتانییەکاندا دەخەوین. پێخەفگەلێکی زۆر لەرادەبەدەریش ڕەحەتو خۆشن، بەڵام لەوە ئاسوودەتر نین کە دەمانەوێت. دەتوانم ئەوەتان پیێ بڵێم هەڤاڵان لەگەڵ ئەو هەموو ئیشە هزرییەی ئێمە لەم ڕۆژانەدا ڕایدەپەڕێنین خۆناتانەوێ لە ئاسودەییەکەی خۆمان ڕووتمان بکەنەوە، ئاخۆ دەتانەوێ هەڤاڵان؟ نایشتانەوێ هێندە زۆر شەکەتمان بکەن کە ئیدی نەتوانین ئەرکەکانمان جێبەجێ بکەین؟ بێگومان هیچ یەکێ لە ئێوە ئارەزووی ئەوە ناکات کە ببینێ جۆنز گەڕاوەتەوە؟

ئاژەڵەکان دەماودەم لەبارەی ئەم خاڵەوە دڵنیایان کردەوەو دەربارەی خەوتنی بەرازەکان لەنێو پێخەفەکانی خانووی نێو مەزراکەدا هیچی زیاتر نەوترا. کاتێکیش چەندەها ڕۆژ دواتر ئەوە ڕاگەیەنرا کە لە ئێستا بەدواوە بەرازەکان بەیانیان سەعاتێك درەنگتر لە ئاژەڵەکانی تر لە خەو هەڵدەستن، دەربارەی ئەوەش پرتەوبۆڵە نەکرا.

لە پاییزدا گەرچی ئاژەڵەکان ماندوو بوون, بەڵام شادمان بوون. ساڵێکی سەختیان هەبوو، پاش فرۆشی بەشێك لە پووشو پەڵاشەکەو دانەوێڵەکە عەمبارەکانی خۆراکی زستان گەلێك زۆروزەبەند نەبوون، لەگەڵ ئەوەشدا

ئاسیاوەکە هەموو شتێکی قەرەبوو کردبوو. تەقریبەن نیوەی بنیات نرابوو. ئێستاکێ پاش دروێنەکردن کەشوهەوایەکی ساف‌و وشکی بەردەوام لە ئارادا بوو، ئاژەڵەکانیش سەختتر لە هەمیشە ڕەنجیان کێشا، بەباشی بیریان لێکردەوە کە شایانی ئەوەیە سەرلەبەری ڕۆژگار بە سەختی کار بکەن‌و بە بلۆکی[134] بەردەوە بێن‌و بچن تا بەئەنجامدانی ئائەمە بتوانن فووتێکی تر دیوارەکە بڵند بکەنەوە. بۆکسەر هەتا شەوانەش دەهاتە دەرێ‌و هەر خۆی بە تەنیا بۆ سەعاتێك یاخود دووان لەبەر تریفەی مانگی خەرمانەداودا کاری دەکرد. لە ساتە زیادەکانی خۆیاندا ئاژەڵەکان بەدەوری ئاسیاوە نیوەچڵ دروستکراوەکەدا دەسووڕانەوەو دەسووڕانەوە، سەرسامبوو بە ڕووختەیی‌و ستوونی[135] بوونی دیوارەکانی‌و حەپەسانیشیان بەوەی کە هەتا ئێستاکە دەبووایە بیانتوانیبایە هەر شتێکی ئەئاوا شکۆدار دروست بکەن. تەنها بێنجامینی پیر ڕەتی دەکردەوە کە لەبارەی ئاسیاوەکەوە بە حەماستر بێت. بەهەرحاڵ وەك هەمیشە لەو تێبینییە تەمومژاوییەی کە گوێدرێژان کاتێکی دوورودرێژ دەژین بەولاوە ورتەی هیچی لێوە نەدەهات.

نۆڤەمبەر لەگەڵ بایەکانی باشوری- ڕۆژئاوادا هات. بنیاتنان دەبووایە ڕابوەستێت, چونکە ئێستاکە ئیدی گەلێك باراناوی و تەڕتر بوو لەوەی بۆ ئاوێتەکردنی چیمەنتۆ بشێت. سەرەنجام شەوێك هات کە زریان هێندە توندوتیژ

---

Block . [134] : خشت، بلۆك، بەردی دەوروبەر سافکراو.

Perpendicularity . [135] : عەمودی، ستوونی، ڕاست بەرەو سەرەوە ڕۆشتوو.

بوو بیناکانی مەزراکەی لەسەر بناغەکانیاندا ڕاهەژاندو چەندین کاشی[136]ش لەبەر بانی تەویلەکەوە توورهەڵدابوو. مریشکەکان هەستابوونو بە تۆقیووی گارەگاریان دەکرد, چونکە هەموویان هاوکات خەونی ئەوەیان بینیبوو کە گوێیان لە تفەنگێك بووە کە لە دوورێکەوە تەقیبوو. سەرلەبەیانی ئاژەڵەکان هاتنە دەرەوەی بەستنگاکانی خۆیان هەتا ببینن کە دارئالآکە توورِدراوەتە خوارەوەو دارێکی نارەوەن کە لە پالێمی باخەکەدا بوو چەشنی سەلکەتوورێك هەڵکێشرا بوو، هەر ئەو کاتە تێبینی ئەوەیان کرد کە هاوارێکی نائومێدانەی لە گەرووی هەموو ئاژەڵێکەوە بەرهەڵدابوو. دزێوترین دیمەن ژووانی چاوەکانیانی کرد. ئاسیاوەکە وێرانە بوو. بە هەماهەنگیەکەوە هەتا جێگاکە دایان لە ڕاکردن. ناپولیۆن. کە هەتا بۆ پیاسەکردنیش بەدەگمەن دەچووە دەرەوە، لەپێش هەموویانەوە ڕایدەکرد. بەڵێ ئالەوێدا ڕاکشابوو، بەرهەمی هەموو تێکۆشانەکانیان لەگەڵ بناغەکانیدا هاوئاست کرابوو، ئەو بەردانەی کە بەو دژوارییە شکاندیانو گواستیاننەوە بە هەموو دەورو زێوارەکەدا پەرتو بلاو ببوونەوە. سەرەتا نەیانتوانی بدوێن، ڕاوەستانو ماتەمبارانە لە خاشاكو وردیلە بەردی کەوتوو ڕامان. ناپولیۆن بە کپیەوە هەنگاوی دەناو دەهاتو دەچوو، جاروباریش بە میشەمیش کردنێکەوە بۆنی عەرزەکەی دەکرد. کلکی لەملاوە بۆ ئەولا تەکانی توندوتیژی دەخواردو ڕەپ دەبوو, کە ئەوە لەودا نیشانەی

136. Tile : کاشی قرمید. بریتیە لەو کاشیانەی کە لە سەربانی سێگۆشە, یاخود شێوە نشێویدا لەسەر یەك دادەنرێت.

چالاکی چڕو توندوتیژی زەینی بوو. لەناکاویش وێستی گرتو وەکو بڵێی قەراری لەسەر شتێك دابێت.

(هەڤاڵان) بەکاوەخۆ وتی: "دەزانن کێ بەرپرسیاری ئائەمەیە؟ ئەو دوژمنە دەناسن کە شەوێ هاتووەو ئاسیاوەکەی نغرۆ کردووین؟" سنۆبۆڵ لەپڕێکا بە دەنگی بروسکاوییەوە نەڕاندی: "سنۆبۆڵ ئەم شتەی بەئەنجام گەیاندووە! بەهۆی شەڕانگێزییەکی پەتیەوە، لە دواخستنی پلانەکانمانو تۆڵەی خۆکردنەوەی لە بەدەرپەڕاندنە شەرماوەرەکەی بیری کردۆتەوە، ئەم ناپاکە لە تاریکی شەودا دزەی کردۆتە ئێرەو کاری نزیکەی ساڵێکی ئێمەی خاپوور کردووە. هەڤاڵان لێرەو هەر ئائێستا من حوکمی مەرگ بەسەر سنۆبۆڵدا دەدەم. مێداڵی (پاڵەوانی ئاژەڵان، پایە دوو)و لەگەڵ نیو بووشێڵش سێو بۆ هەر ئاژەڵێك کە بۆ بەردەم داوەریی[137] ڕاپێچی بکات. یەك بووشێڵی پڕو تەواویش بۆ هەریەکێك کە بە زیندوویی دەستگیری بکات.

ئاژەڵەکان لەڕادەبەدەر تووشی شۆك هاتبوون کە ئەوە بزانن هەتاکو سنۆبۆڵیش دەکردێ تاوانباری کردەوەیەکی ئەئاوا بێت. لەوێدا هاواری شێتگیریی بەرزبۆوەو هەموو کەسێکیش کەوتبووە تێفرین لە ڕێگاکانی دەستگیرکردنی سنۆبۆڵ ئەگەر بێتو هەر کاتێك بێتەوە. تەقریبەن یەکسەر جێپێی بەرازێك لەنێو گژوگیای نەختێك لەولای تەپۆڵکەکەوە دۆزرایەوە. دەتوانرا تەنها بۆ چەند یاردەیەك جێپێیەکان هەڵبگیرێن، بەڵام دیاربوو کە دەچووەوە سەر کونێك نێو

---

137. Justice : عەدالەت. هێنانی بۆئەوەی حوکمی دادپەروەرانەی بەسەردا بدرێت.

هێجەکە ناپولیۆن بە میشەمیشکردنێکی قوولەوە بۆنی کردنو ڕایگەیاند کە هی سنۆبۆڵن. وەکو بۆچوونی خۆی ئەوەی ئاشکرا کرد کە ڕەنگە سنۆبۆڵ لە ئاقاری مەزرای فۆکس ودەوە هاتبێ.

(دواخستن ئیدی بەسە، هەڤاڵان) ناپولیۆن کاتێ کە جێ پێیەکانی تاقیکرابوونەوە شیراندی. ئیش هەیە پێویستە ئەنجام بدرێت. ئائەم بەیانیە دەست دەکەین بە دروستکردنەوەی ئاسیاوەکەو بەدرێژایی هەموو زستانیش باران بێت, یاخود خۆرەتاو بێت بنیاتی دەنێینەوە. ئەم کلۆڵە ناپاکەش وا دەرس دەدەین هەتا بزانێت کە هەرگیز ناتوانێت ئاوا بەئاسانی ئیشەکەی ئێمە هەڵوەشێنێتەوە. لەیادتان نەچێت هەڤاڵان نابێ لە پلانەکانماندا گۆڕانکاری هەبێت: دەبێت هەتا سەرکەوتن جێبەجێ بکرێت. بۆ پێشەوە هەڤاڵان! هەر بژی ئاسیاوەکە، هەر بژی مەزرای ئاژەڵان!.

# بەشی حەوتەم

زستانێکیتووش بوو. کەشوهەوا تۆفانیەکە بەفرو تەرزەشی بەدوادا هاتو دواتریش بە شەختەیەکی سەخت کە تەواو هەتا نێوەندی فێبریوەری نەڕەوییەوە. ئاژەڵەکان بەوپەڕی توانای خۆیان لە بنیاتنانەوەی ئاسیاوەکە بەردەوام بوون، زۆر چاك ئەوەیان دەزانی کە دونیاکەی دەرەوە چاودێری دەکردنو ئەوەشیان دەزانی کە ئادەمیزادە بە ئیرەییەکان شادو سەرفراز دەبوون ئەگەر ئاسیاوەکە لە کاتی دیاریکراوی خۆیدا تەواو نەبێت.

لە داخا ئادەمیزادەکان وایان دەردەخست کە باوەڕ ناکەن بەوەی سنۆبۆڵ ئاسیاوەکەی خاپوور کردبێت: ئەوەیان دەوت کە بەهۆی زۆر تەنکی دیوارەکانەوە داڕووخابوو. ئاژەڵەکان ئەوەیان دەزانی کە ئەمە هەقیقەت نەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا بڕیار درابوو کە ئەمجارە لەجیاتی هەژدە ئینجەکەی پێشوو سێ فووت ئەستوور تر

دروستی بکەن، کە ئەمەش کۆکردنەوەی ژمارەیەکی گەلێك گەورەتری بەردی دەگەیاند. بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ کوواییەکە کەیلی کەڵەکە بەفرێکی هەواڕاداو ببوو نەدەتوانرا هیچ شتێکیش ئەنجام بدرێت. لەو کەش وبایە وشكو سەهۆڵبەندییەی کە لەدواییدا سەرومڕ بوو هەندێك پێشکەوتن بەدەست هێنرا، بەڵام کارێکی منەتبارانە بوو، ئاژەڵەکانیش نەیاندەتوانی دەربارەی ئەوە هەندێك هەست بە ئومێدەواری بکەن وەکو ئەوەی کە لە پێشتردا هەستیان پێ کردبوو. هەمیشە سەرمایان بوو، هەروەها بەردەوامیش لاکەیان دەهات، تەنها بۆکسەرو کلۆڤەر نائومێد نەبوون. سکویلەر کۆمەڵێ گوتاری بێهاوتای لەسەر خۆشحاڵی خزمەتکردنو شکۆی زەحمەتکێشانەوە پێشکەش کرد، بەڵام ئاژەڵەکانی دیکە لە هێزو نەترەی بۆکسەرو لەو هاوارە- شکست نەخواردووەیەوە پەیان بە ئیلهامێکی پتر دەبرد کە دەیوت (من سەختتر کاردەکەم!)

لە ژەنیوەریدا خۆراك کەمی هێنا. ئازووخەی دانەوێڵە بەشێوەیەکی توندوتیژ کەم کرایەوەو ئەوە ڕاگەیەنرا کە ئازووخەی زیادەی پەتاتە دابەش دەکرێت هەتا جێی دانەوێڵەکە بگرێتەوە. دواسا پەی بەوە برا کە بەشێکی زۆری بەروبوومی پەتاتەکە لە تێپەستانو فشاری نێو کەڵەکەکردندا بەستبووی, چونکە بە ڕووپۆشێکی ئەستوورو لەبار دانەپۆشرابوو. پەتاتەکان بلّو ڕەنگپەڕیو ببوونو تەنها چەند دانەیەکیان بۆ خواردن دەشیان. بۆ چەندین ڕۆژی چوونیەك ئاژەڵەکان بێجگە لە کارو گاچەوەنەر شتێکی تریان نەبوو بیخۆن. وێدەچوو کە برسێتی لە

چڕوچارەیان ئەبڵەق بوویێت. شاردنەوەی ئەم فاکتەرە لە دنیاکەی دەرەوە پێداویستییەکی ژیانی[138] بوو.

بە داتەپینی ئاسیاوەکە دنەدراو ئادەمیزادەکان دەربارەی مەزرای ئاژەڵان خەریکی ئەفراندنی کۆمەڵێ درۆی تازەبابەت بوون. جارێکی تریش دەمگۆ بڵاوکرابۆوە کە سەراپای ئاژەڵەکان لە سۆنگەی قاتوقڕیو بیمارییەوە خەریکبوو دەمردن و ئائەوەش کەوا بێ لێبڕ لەنێوانی خۆیاندا خەریکی شەڕوهەرا بوونو پەنایان وەبەر کانیباڵیزم[139]و بەچکەکوژیی[140] هێنابوو. ناپولیۆن زۆر بەباشی ئاگاداری ئەو سەرەنجامە خراپانە بوو کە ڕەنگبوو وەدی بێن گەر بهاتباو دەربارەی بارودۆخی خۆراك فاکتەرە ڕاستەقینەکان بزانرێنو بڕیاریشی دا کە لە بڵاوکردنەوەی بۆچوونی پێچەوانەدا لە مستەر وایمپەر سوود وەربگیرێت. هەتا ئەو کاتەش ئاژەڵەکان کەمێك یاخود هیچ بەرخوردێکیان لەگەڵ وایمپەردا نەبوو هەتا لەو ئان وکاتانەشدا کە سەردانی هەفتانەی خۆی دەکرد: ئێستاکە بەهەرحاڵ چەند ئاژەڵێکی دەستەبژێرکراو کە زۆرینەشیان مەڕ بوون, ڕێنمایی کرابوون کە جاروبار تێبینی ئەوە بدەنە بەرگوێی لە ئازووخەکانیان زیاد کرابوو. سەرباری ئەوەش ناپولیۆن فەرمانی ئەوەی دەرکرد کە ئەو سنووقە تەقریبەن خاڵیانەی نێو عەمبارەکە کەم و زۆر لە لم لێوانلێو بکرێن, لە پاشانیشدا بە بەرماوەی دانەوێڵەو

---

[138]. Vitally : بایەخێکی سەر ئاسا بوون. مەسەلەی ژیانو مردن.

[139]. Cannibalism : مرۆڤخۆریی. پیاوخۆریی. ئادەمخۆریی.

[140]. Infanticide : منداڵکوژیی، بەچکەکوژیی.

خۆراك داپۆشرێن. بە هەندێ بیانووی تەبا وایمپەریان بە عەمبارەکەدا تێپەڕاندو ئەوەیان لواند هەتاکو سەرپێی سنووقەکان ببینێت. هەڵخەڵەتێنراو بەردەوامبوو لەوەی کە ڕاپۆرتی ئەوە بە دنیای دەرەوە بگەیەنێ کە لە مەزرای ئاژەڵاندا کەم و کاسیی خۆراك نەبوون. لەگەڵ ئەوەشدا بەرەو کۆتایی ژەنیوەری ڕوون و ئاشکرا بوو کە زەرووری دەبوو هەندێکی تر دانەوێڵە لە لایەکەوە وەگیر بکەوێت. لەو ڕۆژانەدا ناپولیۆن بەدەگمەن خۆی پیشانی ئاپۆرە دەدا، بەڵام وەختەکەی خۆی سەرجەم لە خانووی نێو مەزراکەدا بەسەر دەبرد، کە لەلای هەر دەرگایەکەوە بەهۆی سەگە ترسناك- دیارەکانەوە پاسەوانی دەکرا, کاتێك کە دەرکەوت لە شێوازێکی سێرەمۆنیانەدا بوو، بە یاساوڵی شەش سەگەوە دەرکەوت کە لە نیزکەوە دەوریان تەنیبوو ئەگەر هەر کەسێکیش زۆر لێی نزیك بکەوتبایەتەوە دەیان نەڕاند. زۆرجار هەتا سەرلەبەیانی یەکشەممەکانیش دەرنەکەت، بەڵام لە ڕێگای یەکێك لە بەرازەکانی ترەوە کە عادەتەن سکویلەر بوو، فەرمانەکانی خۆی پەخش دەکردەوە.

بەیانی یەکشەممەیەك سکویلەر ئەوەی ڕاگەیاند کە مریشکەکان کە تازە وەژوور کەوتبوون بۆئەوەی دووبارە هێلکە بکەن، دەبێ هێلکەکانیان بدەن بەدەستەوە. ناپولیۆن لە ڕێگای وایمپەرەوە هەفتانە گرێبەندنامەی چوارسەد هێلکەیی قبووڵ کردبوو. نرخی ئائەمانە هەتا هاتنی هاوین پارەی هەندێ دانەوێڵەو خۆراك دەداتو ئاسانتر بوونی بارودۆخی مەزراکە دەپارێزێت.

کاتێك کە مریشکەکان گوێبیستی ئائەمە بوون قیژەقیژێکی ترسناکیان بەرپا کرد. پێشتر ئاگادار کرابوونەوە کە ئەم خۆبەختییە ڕەنگە زەرووری بێت، بەڵام باوەڕیان بەوە نەکردبوو کە لە ڕاستیدا ڕوودەدات. تازە باوەشی خۆیان بۆ کڕکەوتنی بەهار ئامادە دەکردو پرۆتێستۆی ئەوەیان دەکرد کە بردنو دوورخستنەوەی هێلکەکان ئێستاکە ئیدی تاوان بوو. ئەمە هەر لە کاتی دەرپەڕاندنی جۆنزەوە یەکەمین جار بوو کە شتێك لەئارادا بێت کە بە یاخیگەریی شەباهەتدار بێت. لەلایەن سێ دانە ڕەشە بارۆکەی تولازی مینۆرکا[141]وە ڕابەری دەکرا، مریشکەکان کۆششێکی سەرسەختانەیان کرد هەتا ئارەزووەکانی ناپولیۆن نەیەنەدی. میتۆدەکەشیان ئەوە بوو کە هەڵفڕنە سەر کۆڵەکەی سەربانەکانو لەوێدا هێلکەکانیان بکەن، کە بە کەوتنە سەر زەوییەکەش دەشکانو داغان دەبوون. ناپولیۆن بە تالووکەو بێ بەزەییانە ڕەفتاری کرد. فەرمانی دا کە ئازووخەی مریشکەکان ڕابگیرێتو حوکمی ئەوەشی دەرکرد کە هەر ئاژەڵێك بە ئەندازەی یەك دەنکە دانەوێڵەش بە یەك مریشك بدات، ئەوا دەبێ بە مەرگ سزا بدرێت. سەگەکان بە ئەنجامگەیاندنی ئەم فەرمانەیان وەئەستۆی خۆ گرت. مریشکەکان بۆ پێنج ڕۆژ بەردەوام بوون، پاشان خۆیاندا بەدەستەوەو دووبارە بۆ سنووقی هێلانەکانی خۆیان گەڕانەوە. هەر لە هەمان کاتیشدا نۆ دانە مریشك مردن. لاشەکانیان لەنێو باخەکەدا نێژراون, وا بڵاوکرایەوە کە بەهۆی

---

141. Minorca : ڕەچەڵەکێکی تایبەتی مریشکەو دەدرێتە پاڵ مینۆرکاوە کە یەکێکە لە دوورگەکانی (بالیار)و دەکەوێتە ڕۆژئاوای دەریای سپی ناوەڕاستەوە.

کۆکسیدیۆسیس[142]ەوە مردن. وایمپەریش هیچ شتێکی دەربارەی ئەم مەسەلەیە نەژنەفتو هێلکەکانیش لە کاتی خۆیدا تەسلیم دەکران، ڤانی[143] بەقاڵێکیش هەفتەی کەرەتێك بۆ مەزراکە لێی دەخوڕی هەتا لەگەڵ خۆیدا بیانبات. ئەم هەموو وەختەش هیچی زیاتر لەبارەی سنۆبۆڵەوە نەزانرا. بەندوباو وابوو کە دەبێ لە یەکێك لە مەزرا هاوسێکاندا خۆی شاردبێتەوە، یان فۆکس ود یاخود پینچ فیلد. ناپولیۆن ئالەم کاتەدا لەگەڵ مەزراگەرەکانی دیکە لە پەیوەندییەکی نەختێك لە جاران باشتردا بوو. وا ڕێکەوت کە لە حەسارەکەدا کەڵەکە دارێك هەبوو کە بەر لە دە ساڵ کاتی بڕینەوەی جەنگەڵی سورەچنارەکە لەوێدا کۆمەڵ کرابوون. وادەکە زۆرباش لەبار بوو، وایمپەریش ئامۆژگاری ناپولیۆنی کردبوو هەتا بیفرۆشێت، هەردوو مستەر پیلکینگتۆن و مستەر فرێدریکیش بە تاسەی کڕینیەوە بوون. ناپولیۆن لەنێوان ئەو دووانەدا دڕدۆنگ بوو، نەیدەتوانی بڕیاری خۆی بدات. تێبینی ئەوەش کرابوو هەر کاتێك وێبچووایە کە خەریکە لەگەڵ فرێدریکدا دەگاتە قەولو قەراری بڕینەوە. وا ڕادەگەیەنرا کە سنۆبۆڵ دەبێ لە فۆکس وددا شاردرابێتەوە. کاتێکیش کە مەیلی بەرەو پیلکینگتۆن دەچوو، دەوترا کە سنۆبۆڵ دەبێ لە پینچ فیلد درابێت.

لەناکاو لە سەرەتای بەهاردا پەی بە ترسناکترین شت برا. سنۆبۆڵ سەرومڕ شەوان بەدزییەوە بۆ مەزراکە دەچوو. ئاژەڵەکان هێندە ئاشیفتە ببوون کە بە

---

[142] Coccidiosis . : نەخۆشیو ئیسیقایەکە تووشی باڵندەو گیانلەبەرە شیردەرەکان دەبێت.

[143] Van . : ئۆتۆمبێلی بارکێشی بچکۆلانە. پیکاب ئاسا.

ئەستەم لە بەستنگاكانی خۆیاندا دەنووستن. ئەوە وترا كە هەموو شەوێك لە تاریكاییدا بەدزییەوە دەهاتو هەموو چەشنە زیانێكی بە ئەنجام دەگەیاند. دانەوێڵەی دزی بوو, سەتڵی شیرەكانی قڵپ كردبۆوە، هێلكەكانی شكاندبوو، سید-بێدەكانی[144] پێماڵ كردبوو، پێستی درەختەكانی میوەی لێكردبووەوەو ونجڕونجڕی كردبوون. هەر كاتێكیش هەر شتێك عەیبدار بووایە شتێكی ئاسایی بوو كە بخرێتەپاڵ سنۆبۆڵ. ئەگەر پەنجەرەیەك شكابووایە, یاخود ئاوەڕۆیەك بگیرابایە یەكێك دڵنیابوو كە بڵێت سنۆبۆڵ لە شەودا هاتووەو ئەنجامی داوە، كاتێكیش كە كلیلی عەمبارەكە بزر بوو تێكڕای مەزراكە لەو باوەڕەدا بوون كە سنۆبۆڵ تووری هەڵدابووە نێو بیرەكەوە. تا ئەو ڕادەیە لاپڕەسەن بوون كە بەردەوام بوون لە باوەڕپێكردن بەوە، هەتا دوای ئەوەش كە كلیلە ونبووەكە لەژێر گونییە خۆراكێكدا دۆزرابۆوە، مانگاكان بەیەك بیروڕاوە ڕایانگەیاند كە سنۆبۆڵ بەدزییەوە چووبووە نێو بەستنگاكەیانەوەو لە كاتی خەودا دۆشیبوونی. جرجەكانیش كە ئەو زستانە سەربەگۆبەنگ بوون، ئەوەیان دەربارە وترا كە ئەوانیش هەروەها هاوپەیمانی سنۆبۆڵ بوون. ناپولیۆن فەرمانی دا كە دەبێت لێكۆڵینەوەیەكی تەواو لە چالاكیەكانی سنۆبۆڵ بكرێت. بە حازربوونی سەگەكانیەوە دەستی كرد بە ئەنجامدانی گەشتێكی وردبینانەی پشكنینی بیناكانی مەزراكەو ئاژەڵەكانی تریش لە مەودایەكی بەرێزەوە بەدوایدا دەڕۆشتن. لەگەڵ هەر چەند شەقاوێكدا ناپولیۆن ڕادەوەستاو بۆ شوێنەواری جێپێیەكانی

□□□. Van : ئەو جێگایەی كە خاكێكی باشی هەیە بۆ تۆوچاندن.

سنۆبۆڵ بۆنی عەرزەکەی هەڵدەمژیو ئەوەشی وت کە دەتوانێ لە ڕێگای بۆنەکەیەوە پەی پێ بەرێت. لە هەموو گۆشەو پەنایەکدا لەنێو تەویلەکە، لەنێو کاوشێدەکە، لەنێو کولانەی مریشکەکان، لەنێو باخچەی سەوزەواتەکەدا بۆنمژی کردو تەقریبەن جێگەوارەکانی سنۆبۆڵی لە هەموو شوێنێکدا دۆزییەوە. قەپۆزی خۆی دەخستە نێو عەرزەکە, چەند هەڵمژینێکی بۆ کردو بە دەنگێکی وەحشەتناکەوە دەیشیراند: (سنۆبۆڵ لێرە بووە! بەئاشکرایی بۆنی دەکەم)و بەرامبەر بە وشەی سنۆبۆڵیش هەموو سەگەکان نەڕەی خوێن- مەیینیان بەرهەڵدا دەکردو دانەکانی ئەملاوئەولایان دەردەخست. ئاژەڵەکان بەتەواوەتی تۆقیبوون. بۆ ئەوان سنۆبۆڵ وەکو بلێیی بە جۆرە کاریگەرییەکی نادیار دەچوو، هەوای دەوروبەریانی دەتەنیەوەو بە هەموو جۆرە خەتەرێك هەڕەشەی لێ دەکردن. ئێوارێ سکویلەر هەموویانی بانگ کردو بە گوزارشتی خەتەرەکەی سەر ڕووخسارییەوە پێی وتن کە بۆ درکاندن هەندێك هەواڵی جیددی پێیە.

(هەڤاڵان) سکویلەر قیژاندی، بە هەستان بە تۆزێك هەڵبەزینەوەی لەملا بۆ ئەولای دەستەپاچەوە گوتی: "ترسناکترین شت دۆزراوەتەوە، سنۆبۆڵ خۆی بە فرێدریکی مەزرای پینچ فیلد فرۆشتووە، کە تائێستا خەریکی پیلانگێڕانە بۆئەوەی هێرشمان بکاتە سەرو مەزراکەمان لێ بستێنێتەوە! کاتێکیش هێرشەکە دەست پێدەکات سنۆبۆڵ وەکو ڕێنماییکەر کاری بۆ دەکات, بەڵام لەوەش خراپتر هەیە. ئێمە وای بۆ چووبووین کە هۆی یاخیگەرییەکەی سنۆبۆڵ بە سادەیی لەخۆبایبوونو تموحەکەی بوو, بەڵام بەهەڵەدا چووبوون. هەڤاڵان ئایا ئێوە ئەوە

دەزانن کە هۆی ڕاستەقینە چی بوو؟ سنۆبۆڵ هەر زۆر لە سەرەتاوە لەگەڵ جۆنزدا هاوپەیمان بوو! سەرلەبەری وەختەکە سیخوڕی نهێنی جۆنز بوو. هەر هەموو لە ڕێگای ئەو بەڵگەنامانەوە سەلمێنراون کە بەدوای خۆیدا جێی هێشتبوونو ئێمەش تازەبەتازە دۆزیومانەتەوە. بەڕای من ئەمە شتێکی زۆر ڕاڤە دەکاتەوە هەڤاڵان. ئایا ئێمە بۆ خۆمان نەمانبینی- خۆشبەختانە بەبێ سەرکەوتن کە چۆن لە شەڕی کاوشێدەکەدا هەوڵی ژێرخستنو وێرانکردنی دەداین؟" ئاژەڵەکان. "حەپەسابوون. ئەمە شەڕانگێزییەك بوو زۆرچاکتر خاپوورکردنی ئاسیاوەکەی لەلایەن سنۆبۆڵەوە دەردەخست, بەڵام چەند خولەکێکی خایاند بەرلەوەی بەتەواوی بتوانن تێبگەن". هەر هەموو وەبیریاندا هاتەوە، یاخود وای بۆ چوون کە وەبیریاندا هاتەوە کە چۆن سنۆبۆڵیان لە شەڕی کاوشێدەکەدا دیتبوو لەپێش هەموویانەوە هەڵمەتی دەبرد، چۆن لە هەموو بۆنەیەکا هانی دەدانو پشتیوانی دەکردن، چۆنیش هەتا بۆ یەك چرکەسات ئێستی نەگرت کاتێك کە فیشەکەکانی تفەنگەکەی جۆنز پشتیان زامدار کردبوو. لە سەرەتادا تۆزقاڵێك دژوار بوو کە ببینن چۆن ئائەمە لەگەڵ لایەنگربوونی ئەو لەگەڵ جۆنزدا سازێنرا هەتا بۆکسەریش کە بەدەگمەن پرسیاری دەکرد سەراسیمە ببوو. لەسەر عەرزەکەدا پاڵکەوت، سمەکانی پێشەوەی ئاخنیە ژێر خۆی، چاوەکانی نوقاندو بە کۆششێکی ئەستەمەوە فۆرمیولای[145] تێفکرینەکانی خۆی بەئەنجام گەیاند. "من باوەڕ بەوە ناکەم" بۆکسەر وتی.

---

Formulate . [145] : فۆرمیولکردن، ڕێکخستن.

"سنۆبۆڵ له شەڕی کاوشێدەکەدا دلاوەرانە دەجەنگا. من خۆم بینیم. ئەی ئێمە خۆمان دەستبەجێ پاش ئەوە (پاڵەوانی ئاژەڵان، پلەیەکمان پێی نەدا؟).

"ئەوە هەڵەکەی ئێمە بوو هەڤاڵ, لەبەرئەوەی ئێمە ئێستا دەزانین- هەر هەموو لەو بەڵگەنامە نهێنیانەدا ڕنووس کراونەتەوە کە ئێمە دۆزیومانەتەوە- کە لە ڕاستیدا ئەو هەوڵی دەدا بەرەو سەرنوشتی شوومی خۆمان هەڵمان پێچێت".

"بەڵام بریندار بوو" بۆکسەر وتی "هەر هەموومان بینیمان بەخوێنەوە ڕایدەکرد". "ئەوە بەشێکی ڕێکەوتنەکەیان بوو!" سکویلەر هاواری کرد "گوللەکەی جۆنز هەر تەنها ڕووشاندبووی. دەمتوانی ئەمەتان بە دەستخەتی خۆی نیشان بدەم. ئەگەر بتانتوانیبایە بتانخوێندایەتەوە. پیلانەکە وابوو کە سنۆبۆڵ لە چرکەساتێکی قەیراناویدا ئیشارەت بۆ هەڵاتن بداتو کێڵگەکەش بۆ دوژمن بەجێ بهێڵێت. بەتەواوی خەریکیش بوو سەرکەوێت- هەتاکو ئەوەش دەڵێم هەڤاڵان سەرکەوتووش دەبوو ئەگەر پێشەوای پاڵەوانمان هەڤاڵ ناپولیۆن نەبووایە. ئایا وەبیرتان نایەتەوە کە چۆن هەر لەو ساتەی جۆنزو پیاوەکانی گەیشتنە نێو حەوشەو حەسارەکە، سنۆبۆڵ لەپڕێکا وەرچەرخاو هەڵات، چەندین ئاژەڵیش بەدوای کەوتن؟ ئایا ئەوەشتان هەروەها نایەتەوە بیر کە هەر لەو ساتەدا بوو کاتێك کە شپرزەیی هەموو لایەکی داگرتبوو, هەموو شتێکیش بەوە دەچوو کە لەکیس چوویێت، کە هەڤاڵ ناپولیۆن بە هاواری (مەرگ بۆ

ئینسانیەت)[146] ەوە بازیدایە پێشەوەو دانەکانی خۆی لە قاچی جۆنزدا چەقاند؟ بێگومان ئەوەتان دێتەوە یاد هەڤاڵان. سکویلەر هاواری لێ هەستاو لە لایەکەوە بۆ لایەکی تر شادانە خەریکی هەڵبەزودابەز بوو.

ئێستاکە ئیدی سکویلەر دیمەنەکەی بەو شێوە گرافیکیە[147] وەسپ دایەوە، وا دیار بوو ئاژەڵەکان وەبیریان هاتبووەوە, لانی کەم ئەوەیان وەبیر هاتبووەوە کە لە ساتێکی خەتەرناکی شەڕەکەدا سنۆبۆڵ وەرچەرخابوو هەتا هەڵبێت, بەڵام بۆکسەر هێشتاش نەختێك نیگەران بوو.

"لەو باوەڕەدا نیم کە سنۆبۆڵ هەر لە سەرەتاوە ناپاك بووە" ئەمەی لە ئاکامدا وت. "لەو کاتەوە هەرچیەکی کردووە ئەوە شتێکی جیاوازە, بەڵام لەو باوەڕەدام کە لە شەڕی کاوشێدەکەدا هەڤاڵێکی باش بوو".

"پێشەواکەمان، هەڤاڵ ناپولیۆن"، سکویلەر ڕایگەیاند "گەلێك لەسەرخۆو شێلگیر دەخاوت". "بێ چوون و چەرا- بەدیاری خست، هەڤاڵ- کە سنۆبۆڵ تەواو هەر لە سەرەتاوە سیخوڕی جۆنز بوو- بەڵێ بە ماوەیەکی درێژیش بەرلەوەی یاخیگەرییەکە هەرگیز بیری لێکرابێتەوە".

"ئا ئەوە شتێکی ترە!" بۆکسەر وتی "ئەگەر هەڤاڵ ناپولیۆن بیلێت، ئەوە دەبێ ڕاست بێت".

---

146. Death to Humanity.

147. Graphically : بەرجەستەو زیندە، هەموو شتێك وەکو خۆی نومایان بکرێت.

"ئا ئەوەیە ڕۆحییەتی ڕاستەقینە، هەڤاڵ!" سکویلەر شیتاندی، بەڵام تێبینی ئەوە کرا کە بە چاوە ترووکەدارەکانی نیگایەکی گەلێك کرێتی گرتە بۆکسەر. وەرسووڕایەوە بڕوات، کەچی لەو کاتەدا وەستاو کاریگەرانە درێژەی دایێ: "هەر هەموو ئاژەڵێکی سەر ئەم مەزرایە ئاگادار دەکەمەوە کە چاوەکانی کراوەو داپچڕاو بهێڵێتەوە, چونکە پاساوی ئەوەمان بەدەستەوەیە کە لەوە بەگومان بین هەندێك لە سیخوڕە نهێنییەکانی سنۆبۆڵ ئا لەم ساتەدا لە مابەینی ئێمەدا خۆیان مەلاس داوە".

چوار ڕۆژ دواتر لە دوانیوەڕۆیەکی درەنگ وەختا ناپولیۆن فەرمانی دا هەتا هەموو ئاژەڵەکان لەنێو حەسارەکەدا کۆببنەوە، کاتێك هەموو پێکڕا کۆبوونەوە ناپولیۆن لە خانووی نێو مەزراکەوە بەدیارکەوت، هەردوو مێداڵەکانی لە خۆی دابوو (چونکە لەو دوا دواییەدا بە -پاڵەوانی ئاژەڵان، پلە یەك-و -پاڵەوانی ئاژەڵان، پلە دوو- خەڵاتی خۆی کردبوو)، بە نۆ دانە سەگە زەبەلاحەکانییەوە کە خۆشحاڵانە بە دەوروبەریدا هەڵدەبەزینەوەو ئەو نەڕانەیان دەرپەڕاند کە مووچڕکەی دەخستە بڕبڕەی پشتی هەموو ئاژەڵەکان. هەر هەموو لە جێگاکانی خۆیاندا بەبێ دەنگییەوە گرمۆڵە ببوون، وێدەچوو پێش وەخت بزانن کە شتێکی ترسناك خەریکی قەومانە.

ناپولیۆن بە سەختی ڕاوەستابوو لە حەشاماتەکەی خۆی هەڵی دەڕووانی، ئەوساکە ناڵەیەکی فرە قووڵی دەرچوواند. دەستبەجێ سەگەکان بەرەوپێشەوە هەڵپەیان کرد، چوار دانە لە بەرازەکانیان مەحکەم بە گوێ گرتو پەلکێشیان

کردن، بە ئازارو ترس‌و سامەوە ڕوو لە پێیەکانی ناپولیۆن دەیانقروسکاند. گوێچکەی بەرازەکان خوێنیان لەبەر دەڕۆیشت، سەگەکان تازە تامی خوێنیان کردو بۆ چەند ساتێك وا بەدیارکەوتن کە بەرەو شێتییەکی تەواو ملیان ناوە. بۆ سەرسامی هەموو کەسێکیش سی دانەیان خۆیان هەڵدایە سەر بۆکسەر. بۆکسەر هاتنیانی بینی‌و سمە مەزنەکانی خۆی ڕایەڵ کرد، هەر لەنێو- حەوادا سرەواندیە سەگێك‌و بە عەرزەکەوە چەسپاندی. سەگەکە بۆ بەزەیی قیژاندنی‌و دووانەکەی تریش کلکیان لە نێوگەڵیاندا هەڵهاتن. بۆکسەر تەماشای ناپولیۆنی کرد تا بزانێ ئاخۆ هەتا کوشتن سەگەکە پێماڵ بکات, یاخود لێی بگەڕێ. ناپولیۆن دیاربوو کە چرۆچارەی گۆڕانکاری بەسەردا هاتبوو، بە توندوتیژییەوە فەرمانی بە بۆکسەر دا واز لە سەگەکە بهێنێت، لەبەرئەوە بۆکسەر سمەکەی خۆی هەڵبڕی‌و سەگەکەش تێکشکاو لوورەدارانە بە دزەدز دوورکەوتەوە. بۆ حاڵی حازر تێکچرژانەکە دامرکایەوە. چوار بەرازەکە کە خەتاباریی لەسەر هەموو هێڵێکی چرۆچارەیاندا نووسرابوو، بە هەڵلەرزینەوە چاوەڕێ بوون. ناپولیۆن ئینجا داوای لێکردن کە دان بە تاوانەکانیاندا بنێن. ئەمانە هەمان ئەو چوار بەرازە بوون کە کاتێ ناپولیۆن کۆبوونەوەی یەکشەممەکانی هەڵوەشاندبووەوە نارەزاییان دەربڕی بوو. بەبێ هیچ دنەدانێکی زیاتر دانیان بەوەدا نا کە هەر لە کاتی دەرکردنی سنۆبۆڵەوە لەگەڵیدا پەیوەندییان بەرقەرار بووە، لە ڕووخاندنی ئاسیاوەکەشدا لەگەڵیدا هاوکار بوونەو ئەوەشیان درکاند کە لەگەڵیدا ڕێکەوتننامەیەکیان بەستبوو تاکو مەزرای ئاژەڵان بدەنە دەست مستەر فرێدریك. ئەوەشیان خستەسەر کە سنۆبۆڵ تایبەتمەندو

خۆبەخۆش بۆ ئەوان دانی پیادا ناوە کە بە درێژایی ساڵانی ڕابردوو سیخوڕی نهێنی جۆنز بووە. کاتێك کە کۆتاییان بە دانپیانانەکانی خۆیاندا هێنا سەگەکان یەکسەر قوڕگیان هەڵدڕین، ناپولیۆن بە وەحشەتناکترین دەنگ داوای ئەوەی کرد کە ئاخۆ هیچ ئاژەڵێکی تر شتێکی ئەوتۆی هەبوو بۆ پێلێنان. ئەو کاتە ئەو سێ مریشکەی کە لە پیلانی سەرپێچیکردن لەسەر هێلکە سەردەستە بوون هاتنە پێشەوەو ڕایان گەیاند کە سنۆبۆڵ هاتبووە خەونێکیانەوەو هانی دابوون سەرپێچی فەرمانەکانی ناپولیۆن بکات، ئەوانیش هەروەها لە ملیان درا. ئینجا قازێك هاتە پێشەوە دانی بەوەدا نا کە لەمیانەی دروێنەکردنی ساڵی پاردا شەش دانە سونبولی دانەوێڵەی شاردبووەوەو لە شەودا خواردبوونی. دواسا مەڕێك دانی بەوەدا نا کە میزی کردبووە ناو حەوزی ئاوخواردنەوەکەوە- ئەمەی بە زۆرلێکردن، ئەئاوای گوت، لەلایەن سنۆبۆڵەوە ئەنجام دابوو- دوو دانە مەڕی تریش دانیان بەوەدا نا کە بەرانێکی بەساڵداچووی گیرۆدەو دووچار بە کۆکە بوو، کە موریدو هەوداری تایبەتی ناپولیۆن بوو، بە ڕاوەدوونانیدا بە دەوروخولی ئاگرێکەوە کوشتبوویان. دەستبەجێ هەموویان لەوێدا سەربڕدران. ئەئاوا سەربهووردی دانپیانانو لەسێدارەدانەکان بەردەوام بوون هەتاکو کەڵەکە لاشەیەك لەبەردەم پێیەکانی ناپولیۆندا کەوتبوون, هەواکەی دەوروبەریش بە بۆنی ئەو خوێنە قورس ببوو کە هەر لە کاتی دەرپەڕاندنی جۆنزەوە ئیدی لەوێدا نەناسراو بوو.

کاتێك کە هەموو شتێك بەسەر چووبوو، ئەو ئاژەڵانەی کە مابوونەوە، بەرازەکانو سەگەکانی لێدەردەچێت، بە دەستەجەمعی دوورکەوتنەوە. ڕاهەژاوو

مەینەتبار بوون. نەیانزانی کامەیان پتر شۆکوار بوون- ناپاکی ئەو ئاژەڵانەی کە خۆیان لەگەڵ سنۆبۆڵدا هاوپەیمان نیشان دابوو، یاخود ئەو سزا توندوتیژەی کە هێند نابێ گەواهیرەری بوون. لە ڕۆژگارە دێرینەکانیشدا زۆرجار دیمەنەکانی خوێنڕشتن بەهەمان ئەندازە ترسناك بوون, بەڵام وێدەچوو بۆ ئەوان ئێستاکێ گەلێك نالەبارتر بێت, چونکە ئەمە لەنێوانی خۆیاندا ڕووی دەدا. هەر لەو ئانەوەی جۆنز مەزراکەی جێهێشتبوو هەتا ئێستاکێ، هیچ ئاژەڵێك ئاژەڵێکی دیکەی نەکوشتبوو، هەتا جرجێکیش نەکوژرا بوو.

بەرەو تەپۆڵکە بچکۆلەکە ڕێیان گرتبوە بەر کە ئاسیاوە نیوەچڵ- دروستکراوەکەی تیادا قیت ببووەوە، هەر هەموو بە سازگارییەکەوە لەسەر عەرزەکەدا هەڵاژان وەکو بلێی بۆ گەرمایی بەیەکەوە چەسپیبوون- کلۆڤەر، میورییەڵ، بێنجامین، مانگاکان, مەڕەکانو تەواوی ڕەوەی قازو مریشکەکان- هەموو کەسێك بێگومان جگە لە پشیلەکە نەبێت، کە لەناکاو بەرلەوەی ناپولیۆن فەرمانی کۆبوونەوە بە ئاژەڵەکان بدات دیار نەمابوو. بۆماوەیەك هیچ کەسێك ورتەی لێوە دەرنەهات. هەر تەنها بۆکسەر بەسەر پێیەکانیدا مابووەوە. بە بێ ئارامییەوە دەهاتو دەچوو، خشەی لە کلکە درێژە ڕەشەکەی خۆی دەهێناو لە دژی ئەملاو ئەولاکانی خۆیدا دەیبزواندنو جاروباریش کورتە کوڕژنی سەرگەشتەیی دەردەپەڕاند. لە سەرەنجامدا وتی: "من لەمە حاڵی نابم. لەو باوەڕەشدا نەبووم کە شتی ئاوا لەسەر مەزراکەی ئێمەدا ڕووبدات. دەبێ بەهۆی هەندێك خەتاوە بێت لە خۆماندا. چارەسەریش هەروەکو من دەیبینم سەختتر

کارکردنە. لە ئێستا بەدواوە دەبێ سەرلەبەیانیان یەك سەعاتی ڕەبەق زووتر هەڵبستم".

دواییش بە نیمچە ڕاکردنە لۆقدارەکەیەوە دوورکەوتەوەو گەیشتە کوارییەکە. کە گەیشتە ئەوێ پایەپەی دوو باری بەردی کۆکردەوەو بۆ خوارێ بەرەو ئاسیاوەکە بە کێشی کردن بەرلەوەی ئەو شەوە دەست لەکار بکێشێتەوە.

ئاژەڵەکان بە دەوروبەری کلۆڤەردا ئاڵکا بوون، هیچ متەقیان لێوە دەرنەدەهات. ئەو تەپۆڵکەیەی کە لە سەریدا پاڵکەوتبوون دیمەنێکی بەرفراوانی سەرانسەری ئەو دەوروبەرەی ئاواییەکەی پێ دەبەخشین. زۆرترین بەشی مەزرای ئاژەڵان لەنێو ڕوانینی ئەواندا بوو- لەوەڕگا دووورودرێژەکە کە تا خوارەوەی جادە سەرەکیەکە گوشاد دەبووەوە، کێڵگەی پووشو پەلاشەکە، بێشەلانەکە، ئەستێڵی ئاوخواردنەوەکە، ئەو کێڵگە کێڵراوانەی کە گەنمە تازە سەرهەڵدراوەکان چڕو کەسك بوون، سەربانی سوری بیناکانی مەزراکەش کە دووکەڵی پێچاوپێچی دووکەڵکێشەکان لێیانەوە بەرزدەبوونەوە. ئێوارەیەکی سامالی بەهار بوو. گیاو هێجە پەلوپۆهاویشتووەکە بە تیشکی مەنگی هەتاوەکە زەرکەفت کرابوون. هەرگیز مەزراکە- کە بە چەشنە سەرسووڕمانێکەوە ئەوەیان وەبیرهاتەوە کە مەزرای خۆیان بوو، هەموو ئینجێکی مولکی خۆیان بوو- خۆی وەکو جێگایەکی ئەوەندە دڵبەستە بە دەستی ئاژەڵەکانەوە نەدابوو. کە کلۆڤەر لە لاپاڵی خوارەوەی گردەکەی ڕووانی چاوەکانی سەرشاری ئەشك بوون. ئەگەر بیتوانیبایە ئەندێشەکانی خۆی ڕابگەیەنێت، دەبووایە ئەوە بڵێت کە ئەمە ئەوە

نەبوو کە ئەوان مەبەستیان بوو کاتێك کە بەرلە ساڵانێکی گوزەرکردوو خۆیان ئامادەکرد هەتا لەپێناوی لەناوبردنی نەژادی ئادەمیزاددا کار بکەن. ئەم دیمەنانەی ترسو کوشتار ئەوە نەبوون کە ئەمان لەو شەوەدا کاتێك کە مەیجەری پیر یەکەمجار بۆ یاخیگەریی هەژاندیانی چاوەڕێکەرو بەتاسەی بوون. ئەگەر ئەو خۆی هەر جۆرە وێنەیەکی لەبارەی دوارۆژەوە هەبووایە دەربارەی کۆمەڵگای ئەو ئاژەڵانە دەبوو کە لە برسێتیو قامچی ڕەها کرابوون، هەر هەموو وەك یەك، هەر یەکێکیش بەگوێرەی توانای خۆی کاری بکردبایە بەهێزەکان بوودەڵەو لاوازەکانیان بپاراستایە، وەکو چۆن خۆی لەو شەوەی گوتارەکەی مەیجەردا بەچکە مراوییە سەرگەردانەکانی بە پێیەکانی پێشەوەی پاراستبوو. لە قەبێڵی ئەوەدا نەیزانی لەبەر چی هاتبوونە دەورانێکەوە کە هیچ کەسێك زاتی ئەوەی نەدەکرد ئەوەی لە هزریدایە بیدرکێنێت، لە کاتێکدا سەگە دڕندەو بەنەڕەنەڕەکان لە هەموو شوێنێکدا دەگەڕانو لە کاتێکیشدا دەبووایە هەڤاڵەکانت ببینیایە کە لەدوای دانپیانانی تاوانە حەپەسێنەرەکانیاندا پارچەپارچە کران. هیچ تێفکرینێکی یاخیگەریی, یاخود سەرکێشیکردن لە هزریدا نەبوو. ئەوەی دەزانی کە شتەکان هەرچۆن بوون زۆر لەوە باشتر ببوون کە لە ڕۆژگارەکانی جۆنزدا پیای تێپەڕیبوونو ئەوەش کە بەرلە هەموو شتێکی تر پێداویستبوو کە بەرلە گەڕانەوەی ئادەمیزادەکان بگیرێت. هەرچیەك ڕوویدا ئەو هەر وەفادار دەمێنێتەوە، سەخت کار دەکات، ئەو فەرمانانەش بەئەنجام دەگەیەنێت کە پێی سپێردرابوونو قبووڵی پێشەوایەتی ناپولیۆنیش دەکات, بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا

ڕەنجکێشان‌و ئومێدخواستنی ئەوو هەموو ئاژەڵەکانی تر لەبەرئەمە نەبوو. بنیاتنانی ئاسیاوەکەو ڕووبەڕووبوونەوەی فیشەکەکانی تفەنگەکەی جۆنز بۆ ئائەمە نەبوو. تێفکرینەکانی ئاوا بوون. ئەگەرچیش بۆ گوزارەلێکردنیان پێداویستی بە وشە هەبوو.

لە کۆتاییدا هەستکردن بەوەی کە ئەمە دەبوو لە هەندێ ڕووەوە یەدەك بێت بۆ ئەو پەیڤانەی ئەو لە توانایدا نەبوو بیان دۆزرێتەوە، بۆیە دەستی کرد بە چڕینی گیانەوەرانی ئینگلستان. ئاژەڵەکانی تریش کە لە زێواریدا ڕۆنیشتبوون سەندیانەوەو سێ جار لەسەر یەك چڕییانەوە- زۆر بە خۆشنەوایانە، بەلاَم هێدی‌و ماتەمبارانە بەشێوازێك کە پێشتر هەرگیز نەیان چڕیبوو.

تازە چڕینی سێیەمین جاریان تەواوکردبوو کە سکویلەر بە دوو سەگەوە گەشتە ئەوێ، بە هەوای ئەوەوە لێیان نزیك کەوتەوە کە شتێکی گرنگی هەیە پێیان بلێت. ئەوەی ڕاگەیاند کە بە فەرمانێکی دانسقەی هەڤاڵ ناپولیۆن گیانەوەرانی ئینگلستان هەڵوەشێنراوەتەوە. لە ئێستا بەدواوە ئیدی چڕینی قەدەغە بوو.

ئاژەڵەکان واقیان وڕما!

"لەبەر چی؟". میوریەڵ هاواری لێ هەستا: "چیدی پێویست نیە، هەڤاڵ". سکویلەر بە ڕەقییەکەوە وتی. گیانەوەرانی ئینگلستان گۆڕانی یاخیگەرییەکە بوو، بەلاَم ئێستاکە ئیدی یاخیگەرییەکە وەدی هاتبوو. لەسێدارەدانی ئەم دوانیوەڕۆیەی خائینانیش ئاخەرین حوکم‌و قەرار بوو. دوژمنی هەردوو دەرەوەو

ناوەوە شکستیان خواردبوو. لە گیانەوەرانی ئینگلستاندا ئێمە تاسەو ئیشتیاقی خۆمان بۆ کۆمەڵگایەکی باشتری ڕۆژگارە هاتووەکان دەربڕی, وەلێ ئەو کۆمەڵگایە ئێستاکێ ئیتر بەرقەرارە. بە ڕوونو ئاشکرایش ئەم گۆرانیە چیدی هیچ ئارمانێك شك نابات. لەگەڵ ئەوەشدا کە زراویان چووبوو، دەشیا هەندێك لە ئاژەڵەکان نارەزایی دەربڕن, کەچی ئا لەم ساتەدا مەڕەکان وەك هەردەم دەستیان کرد بە بارەبارِی (چوار قاچ باشە، دوو قاچ خرایە) کە بۆ چەندین دەقیقە درێژەی بەخۆوە گرتو کۆتایشی بە گفتوگۆکە هێنا.

ئەئاوا گیانەوەرانی ئینگلستان ئیتر چیدی نەبیسترایەوە. لە جێگای ئەوەدا مینیمەسی شایەر گۆرانیەکی دیکەی هەڵبەست کە ئاوا دەستی پێکرد:

مەزرای ئاژەڵان، مەزرای ئاژەڵان

قەت لە سایەی من بۆت نایە زیان

ئائەم گۆرانیەش هەموو بەیانییەکی یەکشەممە لە پاش هەڵدانی بەیداخەکە دەچڕدرا, بەڵام بە جۆرێ کە نە پەیڤەکانو نە ئاوازەکەش بۆ ئاژەڵەکان بەوە نەدەچوون هاوئاستی ئەوانەی گیانەوەرانی ئینگلستان بن.

# بەشی هەشتەم

چەند ڕۆژێك پاش ئەوە، کاتێك کە ئەو ترس‌و بیمەی سێدارەدانەکان سۆنگەی بوون خامۆش بۆوە، هەندێك لە ئاژەڵەکان وەبیریان هاتەوە- یاخود وای بۆچوون کە وەبیریان هاتەوە- کە شەشەمین ڕاسپاردە ئەوەی فەرمان دەدا کە (هیچ ئاژەڵێك نابێ هیچ ئاژەڵێکی تر بکوژێت), بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هیچ کەسێك مەیلی ئەوەی نەبوو لە کاتی گوێڕادێرانی بەرازەکاندا, یاخود سەگەکاندا ئاماژەی پێ بدات، وا هەست دەکرا ئەو کوشتەو بڕەی کە ڕوویدا لەگەڵ ئەمەدا نەدەگونجا. کلۆڤەر داوای لە بێنجامین کرد هەتا شەشەمین ڕاسپاردەی بۆ بخوێنێتەوەو کە کاتێکیش بێنجامین وەکو پیشەی هەموو کاتێکی ئەوەی ڕەت کردەوە کە لەم جۆرە گیروگازانەدا خۆهەڵقورتێنێ. چوو میوریەڵی هێنا، میوریەڵ ڕاسپاردەکەی بۆ خوێندەوە. ئاوا ڕەوتی دەگرت: (هیچ ئاژەڵێك نابێ هیچ ئاژەڵێکی تر بکوژێت بەبێ هۆ). بەجۆرێك, یاخود جۆرێکی دی دوو وشەکەی پاشین لە یادەوەری

ئاژەڵەکاندا دزەی کردبووە دەرێ, بەڵام ئێستا ئیدی ئەوەیان بەدی کرد کە ڕاسپاردەکە سووکایەتی پێ نەکرابوو، چونکە بە ڕوونو ئاشکرایی هۆی بەجێ هەبوو بۆ کوشتنی ئەو ناپاکانەی لەگەڵ سنۆبۆڵدا یەکێتیەکیان پێکهێنابوو. بەدرێژایی ئەو ساڵە ئاژەڵەکان هەتا لەوەش سەختتر کاریان کرد کە لە ساڵی پێشووتردا کردبوویان بۆ بنیاتنانی ئاسیاوەکە، بە دیواری دوو هێندە قەبەو ئەستوورتر لە هینەکەی جارانو بۆئەوەی ڕێك لە وەختی دیاریکراوی خۆیدا تەواو بکرێتو پێکڕاش لەگەڵ ئەنجامدانی ئیشی ئاسایی مەزراکەدا نا ئاساییترین زەحمەتکێشان بوو. جاری واهەبوو کە بۆ ئاژەڵەکان وادەهاتە بەرچاو کە سەعاتهایەکی دوورودرێژتر کاریان دەکردو لەوەش چاکتر دەرخوارد نەدەدران کە لە ڕۆژگارەکانی جۆنزدا دەرخوارد درابوون.

سەرلەبەیانی یەکشەممەکان سکویلەر کاغەزێکی باریکەلەی درێژی بە سمەکەی خۆی دەگرت، لیستەی ژمارەکارییەکی بە دەنگی بڵند بۆ دەخوێندنەوە کە زیادبوونی بەرهەمهێنانی هەموو جۆرە کەرەستەیەکی خۆراکی بە ڕێژەی لە سەدا دووسەد، لە سەدا سێ سەد، یاخود لە سەدا پێنج سەدی بەگوێرەی بارودۆخەکە دەسەلماند، ئاژەڵەکان بۆ باوەڕپێکردنی هیچ هۆیەکیان بەدی نەدەکرد، بەتایبەتیش لە کاتێکدا کە چیدی زۆر بەڕوونی نەدەهاتەوە بیریان کە بارودۆخەکان بەر لە یاخیگەرییەکە چۆن چۆنی بوون. هەموو شتێك وەکو خۆی بوو، ڕۆژانێك بوو هەستیان دەکرد کە بەو نزیکانە ژمارەکارییەکی کەمترو خۆراکێکی زیاتریان دەبێت.

ئێستاکانە هەر هەموو فەرمانەکان لەرێی سکویلەر, یاخود لەرێی یەکێکی تر لە بەرازەکانەوە بلاّودەکرانەوە. ناپولیۆن خۆشی لەنێو ئاپۆرەدا تەقریبەن بەرادەیەك کە لە دوو هەفتەدا جارێکیش نەدەبینرا. کاتێك کە دەردەکەوت نەك هەر بە سەگە دەستوپێوەندەکانیەوە پاشکۆیەتی دەکرا, بەڵکو بە کەڵەشێرۆکەیەکی رەشەوە کە لەبەردەمیدا هەنگاوی دەناو تا ئەندازەیەکیش وەکو شەیپورژەن رەفتاری دەکرد، بەرلەوەی ناپولیۆن قسە بکات کە لە خانووی نێو مەزراکەدا ناپولیۆن لە ئەپارتمانی[148] جودا لەوانی ترەوە سەقامگیر ببوو ژەمە خۆراکەکانی تاقو تەنێ دەخوارد، دوو سەگ بە خزمەتکردنی رادەپەرینو هەمیشەش خواردنەکەی لە تاقمی (کراون داربی)[149] تایبەت بە دەعوەتەکاندا دەخوارد کە هەر لەنێو دۆڵابە شووشەییەکەی ژووری- میواندا بوون. ئەوەش راگەیەنرابوو کە تفەنگەکە هەموو ساڵێك لە رۆژی لە دایکبوونی ناپولیۆنو ئەو دوو ساڵرۆژەی تریشدا دەتەقێنرێت.

ناپولیۆن ئێستا ئیدی هەرگیز وەکو (ناپولیۆن)ێکی هاکەزایی رانەدەگەیەنرا. هەردەم لە شێوازێکی رەسمیانەدا بە (پێشەواکەمان، هەڤاڵ ناپولیۆن) ئاماژەی بۆ دەکراو بەرازەکانیش حەزیان دەکرد نازناوی ئەوتۆی وەکو باوکی هەموو ئاژەلاّن،

---

[148]. Apartman : شوققە. خانووی سەربەخۆی باڵەخانە. جێگای لائیدە.

[149]. Crown- Derby : تاقمی قاپوقاچاخی پۆرسەلین (چینی) کە لە ناوچەی داربی لە ئینگلتەرادا دروست دەکراو زۆرجار بە تاجێك لەسەر پیتی (D)دا نیشانە دەکرا.

ترس‌و لەرزی ئادەمیزادان، پارێزەری گەوری مەڕان، هاوڕێی بەچکە مراویان‌و لەو جۆرەی بۆ دابهێنن. سکویلەر لە گوتارەکانیدا بە فرمێسك هاتنەخوارەوە بە ڕوومەتەکانیدا لەبارەی ژیریی‌و حیکمەتی ناپولیۆن‌و پاکی‌و میهرەبانی دڵی‌و ئەو خۆشەویستییە قووڵەی کە بۆ ئاژەڵانی هەموو شوێنێك هەیبوو، هەتا بەتایبەتیش ئەو ئاژەڵە بەدبەختانەی کە هێشتاش لە نەفامی‌و کۆیلایەتی مەزراکانی تردا دەژیان دەدوا. ببوو بە عادەت کە شانازی هەموو دەستکەوتێکی سەرکەوتووانەو هەموو بەخت یاربوونێکی باشیش بە ناپولیۆن ڕەوا ببینرێت. زۆرجار دەتبیست کە مریشکێك بە یەکێکی دی دەوت: "لە سایەی ڕێنمایی پێشەواکەمان هەڤاڵ ناپولیۆن، من لە شەش ڕۆژدا پێنج هێلکەم کردووە"، یاخود دوو مانگ، کە لەزەتیان لە خواردنەوەی ئاوی حەوزەکە دەبینی، هاواریان دەکرد "سوپاس بۆ پێشەوایەتی هەڤاڵ ناپولیۆن، کە چەنێ تامی ئەم ئاوە نایابە!" هەست‌و سۆزی گشتی سەرمەزراکە لە چامەیەکدا کە بەناونیشانی (هەڤاڵ ناپولیۆن)ەوە گوزارەی لێکرابوو، کە لەلایەن مینیمەسەوە هەڵبەسترابوو بەم شێوەیەی خوارەوەش ڕچەی دەگرت:

ئەی هاوڕێی بێ باوکان!
ئەی هەوشاری بەختەوەری!
سەروەری سەتڵی گەندو زبڵ‌و!
ئۆی، چۆن لەسەر ڕۆحم لەسەر
ئاگرە وەختێ لە تۆ ڕادەمێنم

چاو ئارامو باڵادەستە،
وەکو هەتاوی ئاسمان،
هەڤاڵ ناپولیۆن!

تۆ بەخشندەی هەموو ئەو شتانەی
کە مەخلوقەکانت عاشقین،
ڕۆژی دوو ژەمی پڕ بەسك،
پووشی خاوێنیش بۆ گەوزان،
گشت گیانەوەرێکی گەورەو بچووك
ئاسوودە لە بەستنگاکەی خۆیدا دەنوێت،
تۆ چاودێری سەرتاسەریت،
هەڤاڵ ناپولیۆن!

ئاخۆ منی بەرازێکی- شیرەخۆرە،
ئاوا زووتر کە گەورە بووە
تا بە وێنەی شووشە پاینت[150]
یاخود بە وێنەی ڕۆڵینگ پین[151]یش

. Pint Bottle... : شووشەی (پاینت) کە پەرداخێکی زلەو یەك لەسەر هەشتی گالۆنێك دەکات.

دەبوو ئەوە فێربووایە
بۆ تۆ ڕاستگۆو بەوەفا بێت
بەڵێ، یەکەمین قارەشی[152] ببێتە
(هەڤاڵ ناپولیۆن!)

ناپولیۆن بەم شیعرە قایل بوو، واشی کرد لەسەر دیواری تەویلە گەورەکەدا لە کۆتایی لایەکەی تری ڕووبەڕووی حەوت ڕاسپاردەکان ڕوونووس بکرێتەوە. لە سەرەوەیدا پۆرترێتێکی ناپولیۆن قەراری دەگرت، وێنەیەکی لاتەنیشتی بوو، لەلایەن سکویلەرەوە بە بۆیەی سپی ئەنجام درابوو. لە هەمان کاتدا لەڕێی ئاژانسەکەی[153] وایمپەرەوە ناپولیۆن لەگەڵ فرێدریکو پیلکینگتۆندا سەرقاڵی دانوستانێکی سەختو دژوار بوو.

کەڵەکە دارەکە هێشتاش هەر نەفرۆشرابوو. لەو دووانە فرێدریك بۆ بەدەستهێنانی لە تاسەتر بوو، بەڵام نرخێکی بەجێی پێشنیار نەدەکرد. لە هەمان وەختدا بەندوباوی نوێکراوەی ئەوە هەبوو کە فرێدریکو پیاوەکانی پلانیان بۆ پەلاماردانی مەزرای ئاژەڵانو وێرانکردنی ئاسیاوەکەی دەگێڕا، ئەو بینایەی ببووە هۆی ئەوەی کە ئیرەییەکی ئاتەشینی تیادا بوروژێنێ. زانرابوو کە هێشتا

---

[151]. Rolling-pin : جۆرە تیرۆکێکی ئەستوورو کورتە.
[152]. دەنگو قیژەی بەراز.
[153]. Agency : ئاژانس. وەکالەت.

سنۆبۆڵ لە مەزرای پێنج فیلّدا خۆی مەلاّس داوە. لە ناوەڕاستی هاوینیشدا ئاژەڵەکان پەشۆکابوون بە بیستنی ئەوەی سێ مریشك بە دەستپێشکەری هاتبوونو دانیان بەوەدا نابوو کە لەلایەن سنۆبۆڵەوە دنەدراون، بەشداری پیلانێك بوون بۆ کوشتنی ناپولیۆن. دەستبەجێ لە قەنارە درابوونو کۆمەڵە خۆپارێزێکی تازە بۆ ئاسایشی ناپولیۆن گیرابوونە بەر. شەوانە چوار سەگ پاسەوانی جێخەوەکەیان دەکرد، هەر یەکێ لە سووچێکداو بەرازێکی بچکۆلانەش کە ناوی (پینکی)ە[154]بوو ئەرکی ئەوەی پێ سپێردرابوو تامی هەموو خواردنەکانی بکات بەرلەوەی بیانخوات نەوەکو ژەهراوی کرابن.

لە دەوروبەری هەمان کاتدا ئەوە ڕاگەیەنرا کە ناپولیۆن ئامادەکارییەکانی جێبەجێ کردبوو هەتا کەڵەکە دارەکە بە مستەر پیلکینگتۆن بفرۆشێو هەروەها بەشداری لە ڕێککەوتننامەیەکی بەردەوامدا بکات بۆ ئاڵوگۆڕکردنی هەندێك بەرهەم لەمیان مەزرای ئاژەڵانو مەزرای فۆکس وددا. پەیوەندی نێوان ناپولیۆنو پیلکینگتۆن بەهەرحاڵ هەر تەنها لە ڕێگای وایمپەرەوە بەڕێوە دەچوو کە هەنووکە تەقریبەن دۆستانە بوو. ئاژەڵەکان وەکو ئادەمیزادێك بڕوایان بە پیلکینگتۆن نەدەکرد, بەڵام ئەویان لە فرێدریك پەسەندتر دەکرد، هەرچەندەش لە هەردووکیان دەترسانو قینیان لێیان دەبووەوە. هەر کە هاوین گوزەری کردو ئاسیاوەکە لە تەواوبوون نزیك کەوتەوە، بەندوباو لەبارەی هێرشێکی ناپاکانەی زووبەزوو بەهێزترو بەهێزتریش دەبوو. ئەوە وترا کە فرێدریك مەرامی وابوو لە دژی ئەواندا

Pinkeye .[154]

بیست پیاوی تفەنگ بەدەست بهێنێ‌و پێشوەختیش بەرتیلی بە قازی‌و دادوەرەکان‌و پۆلیس دابوو کە ئەگەر بتوانێ تەنها کەرەتێك دەست لە قەباڵەی موڵکایەتی[155] مەزرای ئاژەڵان گیر بکات، ئەوا ناخرێتە ژێر هیچ پرسیارێکەوە, لەمەش بترازێ چەردە شایعەیەکی وەحشەتناك دەربارەی ئەو جەوروستەمەی کە فرێدریك لەسەر ئاژەڵەکانی خۆیدا پیادەی دەکردن، لە پینچ فیلدەوە دزەیان دەکردە دەرەوە. ئەسپێکی بەساڵداچووی هەتا مردن قامچی ئاژن کردبوو، مانگاکانی برسی کردبوو، سەگێکی هەر بە هاویشتنە نێو کوورەوە کوشتبوو، لە ئێوارەکاندا خۆی بەوە سەرگەرم کردبوو کە کەڵەشێرەکانی بە پارچە گوێزانی شەتەکدراو بە ئاژنەی[156] قاچەکانیانەوە بەشەڕ دەدا. خوێنی ئاژەڵەکان غەزەب دەیجۆشاند کاتێك کە لەبارەی ئەم شتانەوە بیستیان کە بەرامبەر هەڤاڵەکانیان کرابوون‌و هەندێکجاریش ئاژاوەو سەروسەدایان بەرپا دەکرد بۆئەوەی ڕێیان پێ بدرێت کە بە کۆمەڵ بچنە دەرێ‌و هێرش بەرنە سەر مەزرای پینچ فیلدو ئادەمیزادەکان وەدەرنێن‌و ئاژەڵەکانیش ڕەها بکەن، بەڵام سکویلەر ئامۆژگاری کردن کە خۆیان لە کردەوە بێ پەرواکان بپارێزن‌و بە ستراتیژیەتەکەی هەڤاڵ ناپولیۆن بکەن.

لەگەڵ ئەوەشدا هەست‌و سۆز دژی فرێدریك لە نەشونمای پتر بوون بەردەوام بوو. سەرلەبەیانی یەکشەممەیەك ناپولیۆن لە تەویلەکەدا بەدیار کەوت‌و ئەوەی

---

155 title-deeds.

156 Spur : ئەو کەڵبە تیژەی کە بە قاچی پەلەوەرو هەندێك باڵندەی ترەوە هەیە.

ڕوونکردەوە کە قەتاوقەت هیچ وەختێك بیری لەوە نەکردبووەوە کە کەڵەکە دارەکە بە فریدریك بفرۆشێت. وتی: "وای دانابوو کە بە هەبوونی سەروکار لەگەڵ نامەردی لەو بابەتەدا لە خوارەوەی ویقاری ئەودا بێت. کۆترەکان کە هێشتاش بۆ پەخشکردنەوەی باسوخواسی یاخیگەرییەکە دەنێردرانە دەرەوە لێیان قەدەغە کرابوو پێ بخەنە هەر شوێنێکی فۆکس ودو هەروەها فەرمانیشیان پێ درابوو کە لەپێناوی دروشمی (مەرگ بۆ فریدریك) واز لە دروشمی پێشینەی (مەرگ بۆ ئینسانیەت)یان بهێنن.

وەلێ لە ئاخروئۆخری هاویندا یەکێکی دیکە لە دەسیسەکانی سنۆبۆڵ ئاشکرا کرابوو. بەروبوومی دانەوێڵە کە تژی بوو لە گژوگیاو پەی بەوە برابوو کە سنۆبۆڵ لە یەکێك لە سەردانە شەوینەییەکانی[157] تۆوی گژوگیای لەگەڵ تۆوی دانەوێڵەدا تێکەڵ کردبوو. ئەو قازە نێرەی کە بە ئاگاداربوونی لە پلانەکەدا تۆمەتبار ببوو لەبەردەم سکویلەردا دانی بە خەتاکەی خۆیدا ناو دەماودەم بەهۆی قووتدانی نایت شەیدبێریی[158] مەرگاوەرەوە خودکوژی کردبوو. ئێستا ئیدی ئاژەڵەکان پەیان بەوە بردبوو کە سنۆبۆڵ هەرگیز- هەروەکو تا بەحاڵ چەندەهایان باوەریان کردبوو- پلەوپایەی (پاڵەوانی ئاژەڵان، پلە یەك)ی پێ نەبەخشرابوو. ئەمە هەر تەنها ئەفسانەیەك بوو کە ماوەیەك دوای شەڕی کاوشێدەکە هەر لەلایەن سنۆبۆڵ خۆیەوە بڵاوکرابووەوە. کەواتە دوور لەوەی مێداڵی بدرێتێ بۆ نیشاندانی ترسنۆکی لە

---

[157]. Nocturnal : شەوانیی. شەوینەیی.

[158]. Night Shade berries: بەری ڕووەکی ژەهراوی. ڕەزڵە. جۆرە توویەکی ژەهراوییە.

شەڕەکەدا سەرزەنشت کرابوو. جارێکی تریش هەندێك لە ئاژەڵەکان ئەمەیان بە سەرسووڕمانێکی گومان هەڵنەگرەوە ژنەفت، بەڵام سکویلەر هەر زوو توانی بەوە قایلیان بکات کە یادەوەرییەکانیان لۆمە هەڵگر بوون.

لە پاییزدا بە کۆششێکی تاقەتپڕوکێنی مەزنەوە- چونکە تەقریبەن هاوکات دەبووایە حاسیلاتەکە کۆبکرێتەوە- ئاسیاوەکە کۆتایی پێ هێنرا. هێشتا دەبووایە مەکینەکانیش دابمەزرێن‌و وایمپەریش خەریکی دانووستانی کڕینیان بوو، بەڵام بیناکە تەواو ببوو. سەرەڕای هەموو دژوارییەك، سەرباری بێ ئەزموونی، سەرباری کەونارایی ئامرازەکان، سەرباری تاڵحی خراپ‌و خیانەتی سنۆبۆڵ، ئیشەکە کە هەتاکو هەمان ڕۆژی تەواوبوونی بە تەنگییەوە هاتبوون. ئاژەڵەکان تەواو شەکەت، بەڵام سەربەرز بوون، بە دەوری شاکارەکەیاندا دەسووڕانەوەو دەسووڕانەوە، هەتا لە کاتی دروستکردنی یەکەمجاریشی زۆر قەشەنگتر دەهاتەبەر دیدەیان. لەوەش بترازێ دیوارەکە دوو هێندەی پێشوو ئەستوورتریش بوو. ئەمجارە هیچ شتێك بەبێ ماددەی تەقاندنەوە لەناوی نابات! کاتێکیش لەوە تێفکرین کە چۆن زەحمەتیان کێشابوو، چ نائومێدییەکیان پێشێل کردبوو، ئەو جیاوازییە مەزنەش کە لە ژیانیاندا ئەنجام دەدرا کاتێك کە سەیلەکان دەسووڕانەوەو دابینەمۆکانیش دەکەوتنەکار- کاتێك کە لەمانەی هەموو تێفکرین شەکەتیان لە کۆڵبۆوەو بەدەوری ئاسیاوەکەدا هەڵبەزودابەزیان دەکردو دەخوولانەوەو دەخوولانەوەو هاواری سەرفرازیان دەردەپەڕاند. ناپولیۆن خۆی بەدرەقەدراو بە سەگەکان‌و کەڵەشێرەکەیەوە هاتە خوارەوە هەتا تەواوی کارەکە بپشکنێ، خودی

خۆی پیرۆزبایی لە دەستکەوتی خودی ئاژەڵەکان کردو ڕایگەیاند کە ئاسیاوەکە ناودەنرێت (ئاسیاوی ناپولیۆن).

دوو ڕۆژ دواتر ئاژەڵەکان هەر هەموو بۆ کۆبوونەوەیەکی تایبەتی بۆ نێو تەویلەکە بانگهێشت کران. سەرسامی بەلاڵیەك ئەفسوونی کردن کاتێك ناپولیۆن ئەوەی ڕاگەیاند کە کەڵەکە دارەکەی بە فرێدریك فرۆشتبوو. سبەینێ واگۆنەکانی[159] فرێدریك دێنو دەست بە گواستنەوەیان دەکەن. بەدرێژایی سەرلەبەری ماوەی دۆستایەتییە ڕووکەشەکەی لەگەڵ پیلکینگتۆندا ناپولیۆن لە ڕاستیدا لەگەڵ فرێدریکدا لە ڕێکەوتنی نهێنیدا ببوو.

سەرجەمی پەیوەندییەکان لەگەڵ فۆکس وددا پچڕێنرابوون، پەیامی سووکایەتی پێکردن بۆ پیلکینگتۆن نێردرابوو، بە کۆترەکان وترابوو خودداری مەزرای پینچ فیلْد بکەنو دروشمەکەیان لە (مەرگ بۆ فرێدریك)ەوە بۆ (مەرگ بۆ پیلکینگتۆن) بگۆڕن. لە هەمان کاتیشدا ناپولیۆن ئاژەڵەکانی دڵنیا کردەوە کە حیکایەتی بەو زووانە هێرشکردنە سەر مەزرای ئاژەڵان بەتەواوەتی ناڕاست بوونو ئەوەش کە ئەو بەندوباوانەی دەربارەی دڕندەیی فرێدریك بوون بەرامبەر بە ئاژەڵەکانی خۆی زیاد لەپێویست لافو زیادەڕەوی بوون. ڕەنگە ئەم قسەلۆکانە هەمووی لە سنۆبۆڵ و جاسوسەکانیەوە سەرچاوەیان گرتبێت. ئێستا ئیدی دوای ئەم هەمموو بەندوباوە ئەوە بەدیار کەوتبوو کە سنۆبۆڵ لە مەزرای پینچ فیلْددا خۆی نەشاردبووەوەو لە ڕاستیدا هەرگیز لە هەمموو ژیانیدا لەوێندەر نەببوو: وا

---

[159]. Wagons : عەرەبانە، گالیسکەی باربەری.

وترابوو کە لە فۆکس وددا خۆشگوزەرانییەکی بەرچاوو گرنگدا- دەژیاو لە ڕاستیدا بەدرێژایی ساڵە ڕابردووکان زیندانییەکی پیلکینگتۆن ببوو.

بەرازەکان بەرامبەر بە بەهرەمەندیو زرنگی ناپولیۆن لە شەیداییدا بوون. بە خۆدەرخستنی دۆستبوون لەگەڵ پیلکینگتۆندا فشاری هێنابووە سەر فرێدریك کە نرخەکەی خۆی دوانزە پاوەند[160] بەرزبکاتەوە, بەڵام سکویلەر وتی چۆنێتییە نائاساییەکەی هزری ناپولیۆن لە ڕاستیدا ئەوەی نیشان دابوو کە ناپولیۆن بڕوای بە هیچ کەسێك نەبوو, نەوەك هەتا فرێدریکیش. فرێدریك ویستبووی پارەی دارەکە بە شتێك بیدات کە پێی دەوترا چێك[161] کە وادەردەکەوت پارچە کاغەزێك بێت بەڵێنی پارەدانەکەی لەسەردا نووسرابێت, بەڵام ناپولیۆن لەوەش زرنگتر بوو کە فریووی ئەو بخوات. داوای کردبوو کە پارەکەی بە پێنج- پاوەندی کاغەزی ڕاستەقینە پێ بدرێت، کە دەبووایە بەرلەوەی دارەکان گوێزرابنەوە درابێتنە دەستەوە. پێشتر فرێدریك پارەکەی دابوو، ئەو بڕەش کە ئەو دابووی هەر بەشی کڕینی دەزگای ئاسیاوەکەی دەکرد.

لەو کاتەشدا کە دارەکان بە خێراییەکی بێ ڕادە عەرەبانەگواز دەکرانەوە. کە هەر هەمووی بران کۆبوونەوەیەکی تایبەتی دیکە بۆ ئاژەڵەکان لە تەویلەکەدا سازدرا هەتا بانکە تۆتەکانی[162] فرێدریك ببینن. بە شادییەوە بزەو خەندەی

---

[160]. Pound : دراوی بەکارهێنراو لە ئینگلستاندا.
[161]. Cheque : واتە چەکی بانکی.
[162]. Bank- Notes : ئەسکەناس. پارەی کاغەز.

دەکردو هەردوو مێداڵەکانی خۆی پۆشیبوو، ناپولیۆن لەسەر پێخەفێکی کای سەر سەکۆکەدا داسەکنابوو، پارەکەش ڕێکوپێك لە تەنیشتیدا لەسەر دەفرێکی چینی هینی چێشتخانەی خانووی نێو مەزراکەدا کەڵەکە کرابوو. ئاژەڵەکان بە ڕیز بە هێواشی تێدەپەڕینو هەریەکەش لە خۆشنودیەکەی خۆی ڕادەما. بۆکسەریش لمۆزی خۆی هەڵبڕی هەتا بۆن بە بانکە نۆتەکانەوە بکاتو بەهۆی هەناسەکانیەوە شتە تەنکە سپییەکان کەوتنە جووڵانەوەو خشەخشکردن.

سێ ڕۆژ دوای ئەوە سەروسەوداو جەنجاڵییەکی تۆقێنەر بەرپا بوو. وایمپەر بە رووخسارێکی زیادەڕەو لە ڕەنگپەڕیویدا بەسەر پاسکیلەکەیەوە بە خێراییەوە بە گوزەرگاکەدا سەرکەوتو هات، لە حەوشەکەدا تووڕی هاویشتە سەر عەرزەکەو بە پرتاو ڕاست بۆ ناو خانووی نێو مەزراکە چوو. ساتی دواتر لە ئەپارتمانەکەی ناپولیۆنەوە دەنگی تێکچڕژانی غەزەبێکی خرۆشاو پەیدابوو. دەنگوباس دەربارەی ئەوەی کە ڕوویدابوو چەشنی ئاگرێکی کێویلە دەوروبەری مەزراکەی تەنیەوە, هەموو بانکە نۆتەکان ساختە دەرچووبوون! فرێدریك دارەکانی بە هەوانتە دەستگیر ببوو!

ناپولیۆن دەستبەجێ تێکڕای ئاژەڵەکانی بانگ کردبوو بە دەنگێکی وەحشەتناکیشەوە حوکمی مەرگی بەسەر فرێدریکدا ڕاگەیاندبوو. ناپولیۆن وتی: "کاتێك کە گیرا، فرێدریك پێویستە بە زیندوویی بکوڵێنرێت." هاوکاتیش ئاگاداری کردنەوە کە پاش ئەم کردەوە ناپاکانەیە دەبێ چاوەڕوانی خراپتریش بکرێت. ڕەنگە فرێدریكو پیاوەکانی لە هەر چرکەساتێکدا هێرشە سەردەمێك-

چاوەڕوان کراوەکەیان بەئەنجام بگەیەنن. لە هەموو پەلێکی هاتنە ژوورەوە بۆ نێو مەزراکە یاساوڵ دانران, بێجگە لەوەش چوار کۆتر بە پەیامێکی ئاتیشیانەوە بۆ فۆکس ود ڕەوانە کران کە ئومێدی ئەوە کرابوو دووبارە پەیوەندییەکی لەبار لەگەڵ پیلکینگتۆندا بنیات بنێتەوە.

هەر ئەو بەیانییەی دواتر هێرشەکە بەرپابوو. کاتێك کە پاسەوانەکان بە پەلەپڕوزێوە بە هەواڵی ئەوەوە هاتنە ژووریَ کە فرێدریكو هەوادارەکانی بە دەروازە پێنج- شیشیەکەدا ڕەت ببوونو هاتبوونە ژوورەوە. ئاژەڵەکان خەریکی قاوەڵتی کردن بوون. ئاژەڵەکان تاڕادەیەك بەجەرگانە کەوتنەرێ بۆئەوەی بەرەنگاریان ببنەوە، بەڵام ئەم کەرەتە ئەو سەرکەوتنە ئاسانەیان نەبوو کە لە شەڕی کاوشێدەکەدا بەدەستیان هێنابوو. پانزدە پیاو بوون، بە نیو دەرزەنە چەکی نێوانیانەوە. هەر کە کەوتنە نێو پەنجا یاردە نزیکەکەوە دەستیان کرد بە تەقەکردن. ئاژەڵەکان نەیاندەتوانی ڕووبەڕووی تەقینەوە ترسناکەکانو فیشەکە پیاداچزاوەکان ببنەوەو هەتا سەرباری تەقەڵلاکانی ناپولیۆنو بۆکسەریش بۆ دیسانەوە کۆکردنەوەو ڕێکخستنیان زووبەزوو پاشەکشەیان پێکرابوو. ژمارەیەك لەوانە تا ئەو ساتە بریندار ببوون، لەنێو بینایەکانی مەزراکەدا داڵدەیان بەخۆ گرتو لە درزەکانو کەلێنی تەختەکانەوە دزەنیگایان دەکرد.

تەواوی لەوەڕگا گەورەکە بە ئاسیاوەکەشەوە بە دەستی نەیارەکانەوە بوون. لەو ساتەوەختەدا بەوە دەچوو کە ناپولیۆنیش تووشی حەپەسان بوبێت. بەبێ متەقکردن دەهاتو دەچوو هەنگاوی دەنا، کلکی دەلەقیەوەو سفت ببوو. نیگا

پڕ ئومێدەکان بە ئاراستەی فۆکس وددا دەنێردران. ئەگەر پیلکینگتۆنو پیاوەکان کۆمەکیان بکردنایە ڕەنگە هێشتاش بیانتوانیبایە یاریەکە بەرنەوە, بەڵام لەو ساتەدا ئەو چوار کۆترە گەڕانەوە کە ڕۆژی پێشووتر ڕەوانەی دەرەوە کرابوونو یەکێکیان پارچە کاغەزێکی لەلایەن پیلکینگتۆنەوە هێنابوو. لە سەریدا وشەکانی (سزای شایستەی ئێوەیە ئەوە) نووسرابوونەوە. لەم ئانوکاتەشدا فرێدریكو پیاوەکانی لە دەوروبەری ئاسیاوەکەدا ڕاوەستابوون. ئاژەڵەکان چاودێرییان دەکردنو منگەمنگی ترسو پەروایەك دەوروبەری تەیکردەوە. دوو دانە لە پیاوەکان نوێڵێكو سلێج هەمەرێکیان[163] دەرهێنابوو. خەریکی ڕووخاندنی ئاسیاوەکە بوون.

مەحاڵە! ناپولیۆن هاواری لێ هەستا: "دیوارەکانمان فرە لەوەش ئەستورتر بنیات ناوە کە ئەوانە دەرەقەتی بێن. لە هەفتەیەکیشدا ناتوانن بیڕوخێنن. بەیارا بن، هەڤاڵان!", بەڵام بێنجامین بە دیقەتەوە چاودێری هەڵسوکەوتی پیاوەکانی دەکرد. ئەو دووانەی کە هەمەرەکەو نوێڵەکەیان پێبوو لە نزیك بناغەی ئاسیاوەکەوە خەریکی هەڵکۆڵینی چاڵێك بوون. بە کاوەخۆو تەقریبەن بە فیزێکی ڕابواردن ئامێزەوە بێنجامین لمۆزە درێژکۆڵەکەی لەقاندەوە.

"منیش وای بۆ چووم" وتی "ئایا تۆ نابینیت کە ئەوان خەریکی چین؟" لە چرکەساتێکی تردا پاودەری تەقاندنەوە[164] دەتەپێننە نێو ئەو چاڵەوە.

---

Sledge Hammer: . [163] تۆخماخ. چەکوشی زۆر گەورەو تۆکمە.

Blasting powder . [164] : پۆدرەی تەقاندنەوە.

بە ترس‌و سامەوە ئاژەڵەکان چاوەڕوان بوون. ئێستاکە ئیدی مەحاڵ بوو لە پەناگای بیناکانەوە سەرچڵی هاتنە دەرەوە بکرێت. دوای چەند خولەکێك پیاوەکان بینران کە بە هەموو ئاقارێکدا ڕایان دەکرد. دواسا گرمەیەکی گوێ کەرکەر بەرپا بوو. کۆترەکان بەنێو حەوادا کەوتنە خولانەوەو هەموو ئاژەڵەکانیش بێجگە لە ناپولیۆن، تەخت خۆیان هاویشتە سەر سك، و ڕووخساری خۆیانیان شاردەوە. کە دووبارە هەستانەوە ئاسیاوەکە لەکوێدا ببوو ئا لەوێدا هەوری زەبەلاحی دووکەڵێکی ڕەش قەتیس مابوو، هێدی هێدی شنەباکە ڕای داو دووری خستەوە. ئاسیاوەکەش لە بەرقەرابوونی خۆی دەستی کێشابۆوە.

بە بینینی ئەمە یارای ئاژەڵەکان تێیان گەڕایەوە. ئەو ترس‌و نائومێدییەی کە ساتی بەر لەوسا هەستیان پێ کردبوو لەو غەزەب‌و تووڕەییەدا خەفە ببوو کە لە دژی ئەو کردارە شەڕانگێزو حەقارەت ئامێزەدا بەرپا ببوو. هاوارێکی قەبەو بەتوانا بۆ تۆڵەسەندنەوە بڵند بووەوەو بەبێ ئەوەی چاوەڕوانی فەرمانی دیکە بکەن بە دەستەجەمعی بەرەو پێشەوە شاڵاویان هێناو یەکسەر بە دوژمن گەشتن. ئەمجارە لەو فیشەکە دڕندانە باکیان نەبوو کە بە سەریاندا وەکو تەرزە دایان دەکرد. شەڕێکی توندوتاڵ‌و وەحشیانە بوو. پیاوەکان دەستڕێژیان کردو دووبارە دەستڕێژیان کردەوەو کاتێك کە ئاژەڵەکان دەستەویەخەیان بوونەوە، بە تێلاو پووتە قورسەکانیانەوە هەڵیان تیزاند. مانگایەك‌و سێ مەڕو دوو قاز کوژران. تارادەیەك هەر هەموو کەسێك بریندار ببوون، هەتا ناپولیۆنیش کە لە دواوەدا سەرپەرشتی ئۆپەراسیۆنەکانی دەکرد, نووکی کلکی بە فیشەکێك پەڕێنرا بوو,

بەڵام پیاوەکانیش بە سەلامەتی دەرنەچووبوون. سێ دانەیان بە جووتکەی سمەکانی بۆکسەر سەریان شکێنرا بوو، دانەیەکی تریان بە قۆچی مانگا ورگی زامدار کرابوو، یەکێکی ترشیان تەقریبەن لەلایەن جێسیو بلوبێڵەوە پانتۆڵەکەی شڕو وڕ کرابوو. کاتێکیش کە نۆ دانە لە سەگە پاسەوانە تایبەتیەکانی خودی ناپولیۆن کە ڕێنمایی کردبوون بەدزییەوە لە پەنای هێجەکەوە پێچ بکەنەوە، ناگەهان لە تەنیشت پیاوەکاندا پەیدابوون. دڕندانە دەیان حەپاند، شپرزەیی دەستی بەسەردا گرتن. پەیان بەوە برد کە دەشێ لە خەتەری ئەوەدا بن کە ئابلۆوقە بدرێن. فرێدریك فریادی بۆ پیاوەکانی کرد کە هەتا هێشتا چوونەدەرەوە لەبار بوو بچنە دەرەوە، چرکەساتی دوای ئەوەش دوژمنی ترسنۆك بۆ هێژایی ژیان ڕاکەڕاکەیان بوو. ئاژەڵەکان ڕێك بەرەو خوارەوە هەتا کۆتایی کێڵگەکە ڕاوەدوویان نانو بە هەندێك تێهەڵدانی ئاخروئۆخرەوە کەوتنە وێزەیان کە لەو دەمەدا ئەوان بە تۆپزییەوە لەمیانی پەرژینە توترکییەکەوە ئاودیوو بوون.

براوە بوون، بەڵام خوێنیان لەبەر دەچۆڕایەوەو داهێزرابوون. هێدی هێدی بە لەنگەلەنگ بەرەو مەزراکە دەستیان بە ڕۆشتنەوە کرد. دیمەنی هەڤاڵە مردووەکانی خۆیان کە لەسەر گیایەکەدا ڕاکشابوون هەندێکیانی هەژاندو هێنایانیە گریان. بۆ ماوەیەکی کەمیش بەبێ دەنگییەکی خەفەتبارانەوە لەو شوێنەدا وەستان کە پێشتر ئاسیاوەکەی تیادا بەرقەرار ببوو. بەڵێ دیارنەمابوو، لە ڕاستیدا دوا شوێنەواری زەحمەتکێشانەکەیان لەبەین چوو بوو! هەتا بناغەکانیش بە نیوەناچڵ نغرۆ ببوون. ئەمجارە لە دورستکردنەوەشیدا وەکو جاری

پێشوو نەیاندەتوانی لە بەردە کەوتووەکان سوود وەربگرن. ئەمجارە بەردەکانیش هەروا دیار نەمابوون. هێزی تەقینەوەکە بۆ مەودای سەدان یاردە دوور هەڵیدابوون, وەکو ئەوە وابوو کە هەرگیز ئاسیاوەکە لەوێدا نەبووبێت.

کە لە مەزراکە نزیك کەوتنەوە سکویلەر، کە لە کاتی شەڕەکەدا بەبێ پاساودان بزر ببوو، بە هەڵبەزودابەزەوە بەرەو ڕوویان دەهات، زەردەخەنەی ڕەزامەندانەی دەکردو کلکی دەلەقاندەوە. ئاژەڵەکانیش لە ئاڕاستەی بیناکانی مەزراکەوە گوێبیستی گرمەی سامناکی تفەنگێك بوون.

"ئەو تفەنگە لەبەرچی دەتەقێنرێت؟" بۆکسەر وتی.

"هەتا سەرکەوتنەکان ڕاگەیەنن!" سکویلەر قیژاندی.

"کام سەرکەوتن؟" بۆکسەر وتی.

چۆکەکانی خوێنیان لەبەردا دەڕۆشت، نالێکی لەدەست چووبوو, سمەکەشی هەڵتلیشابوو، دەرزەنە گوللەیەکیش خۆیان لە قاچی دواوەیدا جێگیر کردبوو.

"کام سەرکەوتن، هەڤاڵ؟ ئەی ئایا دوژمنمان لەسەر خاکی خۆماندا -خاکی پیرۆزی مەزرای ئاژەڵان- وەدەر نەنا؟".

"بەڵام ئاسیاوەکەیان وێران کرد. کە ئێمە بۆ دوو ساڵ ئیشمان لەسەر کردبوو!"

"جا چ بایەخێکی هەیە؟ ئاسیاوێکی دیکە دروست دەکەین. ئەگەر ئارەزوو بکەین شەش دانە ئاسیاو دروست دەکەین. هەڤاڵ تۆ پێزانیت نیە بۆ ئەو شتە تەوانمەندەی کە ئێمە بەئەنجامان گەیاند. دوژمن ئا ئەم زەمینەیان داگیر کردبوو

که له سەریدا ڕاوەستاوین. ئێستاش -سوپاس بۆ پێشەوایەتی هەڤاڵ ناپولیۆن- دووباره هەموو ئینجێکمان وەدەست هێنایەوه!".

"کەواتە پێشتر هەرچیەکمان هەبوو دەستگیرمان کردەوه" بۆکسەر وتی.

"ئا ئەوه سەرکەوتنی ئێمەیه" سکویلەر وتی.

به لەنگەلەنگەوه بۆ نێو حەسارەکه چوون. ئەو گوللانەی که لەژێر پێستەی قاچی بۆکسەردا بوون ئازاربەخشانه چزەیان لێوه دەهێنا. لەبەردەمی خۆیدا ڕەنجی تاقەتپڕوکێنی له بناغەوه دروستکردنەوەی ئاسیاوەکەی بینیو ئێستا ئیدی لەنێو درکو خەیاڵدا خۆی بۆ ئەو ئەرکه تەیار دەکرد, بەڵام بۆ یەکەمین جار به هزریدا ئەوه ختوورەی کردبوو که عومری یازده ساڵان بوو دەشیا ماسوولکه مەزنەکانی بەتەواوەتی ئەوه نەبن ئیدی که بەر لەوسا ببوون, بەڵام کاتێك ئاژەڵەکان ئاڵا سەوزەکەیان به شەکاوەیی بەدی کردو دیسانەوه گوێیان له تەقینەوەی تفەنگەکه بوو- که سەرلەبەر حەوت جار تەقەی کردو- گوێبیستی ئەو گوتاره بوون که ناپولیۆن پێشکەشی کرد، که تیایدا پیرۆزبایی هەڵسوکەوتەکەیانی کرد، هەتا بۆ ئەوان بەوەیشی دەکرد که له ئاکامی هەموو ئەوەدا سەرکەوتنێکی مەزنیان وەدەست هێنابوو. ئەو ئاژەڵانەش که له شەڕەکەدا کوژرابوون کفن ودفنێکی ڕەسمیان بۆ ئەنجام درا. بۆکسەرو کلۆڤەر ئەو واگۆنەیان ڕادەکێشا که وەکو تەرمکێش خزمەتی دەکردو خودی ناپولیۆن خۆشی له پێشەوەی کۆڕەوەکەدا هەنگاوی هەڵگرتبوو. دوو ڕۆژی ڕەبەق بۆ ئاهەنگ گێڕان تەرخان کرا. کۆمەڵێ گۆرانی و کۆمەڵێ گوتارو کۆمەڵێ تەقەی پتری

تفەنگەکەش پێشکەش کران‌و بەسەر هەر ئاژەڵێکدا خەلاتی تایبەتی یەك سێوو بۆ هەر پەلەوەرێك دوو ئاونس[165] دانەوێڵەو بەسەر هەر سەگێکیشدا سێ پسکیت بەخشرا. ڕاگەیەنرا کە شەڕەکە بە شەڕی ئاسیاوەکە ناوزەد دەکرێت‌و ئەوەش ڕاگەیەنرا کە ناپولیۆن میدالێکی نوێی داهێنابوو، بەناوی میدالیای بەیداخە سەوزەکە کە پێشکەش بە خۆی کردبوو. لەو خۆشی‌و شادییە سەرتاپاگیرییەشدا سەرهاتی شوومی بانکە- نۆتەکان لەبیر چووبوونەوە.

چەند ڕۆژێك ئا لەمە پاشتر بوو کە بەرازەکان لە ژێرزەمینی خانووی نێو مەزراکەدا ڕێکەوتی سنووقە ویسکییەکیان کردبوو. ئەو کاتەی کە بۆ یەکەمین جار دەستیان بەسەر خانووەکەدا گرتبوو پەی بەوە نەبرابوو. ئەو شەوە لە خانووی نێو مەزراکەوە دەنگی بڵندی گۆرانی وتن دەهاتە بەرگوێ‌و لە سەرسامی هەموو کەسێکیشدا ئاوازەکانی گیانەوەرانی ئینگلستانیان تیادا تێکەڵوپێکەڵ ببوو. لە دەوروبەری نۆو نیودا ناپولیۆن بە کلاوێکی دێرینەی بۆوڵەری[166] مستەر جۆنزەوە، بە ڕوون‌و ئاشکرایی بینرابوو کاتێ کە لە دەرگاکەی پشتەوەڕا بەدیار کەوتبوو، بە خێرایی بە دەوروبەری حەسارەکەدا غاری دابوو، ئینجا دووبارە لەنێو ماڵەکەدا بزر ببوو، بەڵام سەرلەبەیانی کشوماتییەکی بێ بن بەسەر خانووی نێو مەزراکەدا ئاوقا ببوو. یەك دانە بەرازیش سەرقاڵانە بەدیار نەدەکەوت.

---

165. Ounce : یەکەیە بۆ کێش‌و دەکاتە (28.35) گرام.
166. Bowler : کلاوێکی ڕەشی خڕیلەیە.

نزیکەی سەعات نۆ بوو کاتێك کە سکویلەر خۆی دەرخست، بە هێواشیو خەمگینییەوە هەنگاوی دەنا، چاوەکانی کزو مات بوون، کلکی شلوشۆق لە پاشەڵیەوە شۆڕببووەوەو لەگەڵ تەواو خستنەڕووی ئەوەی کە بە جیددی دەردەدار بێت. تێکڕای ئاژەڵەکانی بانگهێشت کردو پێی وتن کە خراپترین پارچە هەواڵی پێبوو کە هاوبەشیان لەگەڵدا بکات. هەڤاڵ ناپولیۆن خەریکبوو دەمرد.

هاواری گریەو فیغانێك بڵندبۆوە. کا لەبەردەم دەرگاکانی خانووی نێو مەزراکەدا بڵاوکرابووەوەو ئاژەڵەکانیش لەسەر نووکی پێ دەڕۆشتن. فرمێسك بە چاوەکانیانەوە لە یەکدییان دەپرسی دەبێ چی بکەن ئەگەر پێشەواکەیان لەدەست بچێت؟! بەندوباو وا بڵاوبووەوە کە سنۆبۆڵ سەرباری هەموو شتێك هۆیەکی داهێنابوو هەتا ژەهر بئاخنێتە نێو خواردنەکەی ناپولیۆنەوە. لە سەعات یازدەدا سکویلەر هاتە دەرەوە هەتاکو ڕاگەیاندنێکی تر پێشکەش بکات. وەکو دوا حوکمو دوا بڕیاری سەرزەمینینی خۆی هەڤاڵ ناپولیۆن فەرمانێکی ڕەسمی ڕاگەیاند: خواردنەوەی ئەلکهول بە مەرگ سزا دەدرێت. بەهەرحاڵو بارێك دەمەدەمی ئێواریێ دەرکەوت کەوا ناپولیۆن هەتا ڕادەیەك باشتر ببووەوە، بەیانیەکەی پاشتر سکویلەر توانیبووی پێیان ڕابگەیەنێت کە زۆرباش خەریکی چاکبوونەوە بوو. نزیك ئێوارەی ئەو ڕۆژە ناپولیۆن بۆ سەر کاروبار گەڕابووەوەو ڕۆژی دواتریش بوو کە زانرا وایمپەری ڕاسپاردبوو هەتا لە وێلینگدۆندا هەندێ نامیلکە لەبارەی بروینگ و[167]دیستیلینگ[168] بکڕێت. هەفتەیەك دواتر ناپولیۆن

---

[167]. Brewing: تەخمیرکردنی بیرە. سازاندنی بیرە.

فەرمانی دا کە حەسارە بچکۆلانەکەی ئەودیوی باخەکە کە پێشتر نیازمەند بـوون وەکو زەمینی- لەوەڕین بۆ ئەو ئاژەڵانـە بیخەنـە لاوە کـە تەمـەنی ئیـشکردنیان تێپەڕانـدبوو، دەبووایـە بکێڵـدرێت. ڕاگەیـەنرابوو کـە لەوەڕگاکـە داهێنرابـوو پێویستیشی بە دووبارە تۆوکردنەوە هەبوو، بەڵام هەر زوو ئەوە زانرا کە نـاپولیۆن خواستی ئەوە بوو بە جۆ بیچێنێت. لە دەوروبەری ئەم کاتەدا سـەرهاتێکی سـەیر ڕوویدا کە بەدەگمەن کەسێك دەیتوانی لێی حـاڵی بێـت. شـەوێك لـە دەوروبـەری سـەعات دوازدە لـە حەوشـەکەدا دەنگـی بەرزبوونەوەیـەکی بڵنـد بـەرپا بـوو. ئاژەڵـەکان لـە بەسـتنگاکەی خۆیانـەوە دەرپەڕینـە دەرێ. شـەوێکی بـە تریفـەی مانگەشەوو ڕۆشن بوو. لە دامێنـی دوا دیـواری تەویلـە گەورەکـەدا، لەوێـدا کـە حەوت ڕاسپاردەکان نووسـرابوونەوە، پەیژەیـەك کـەوتبووە خـوارێ‌و ببـوو بـە دوو پارچەوە. سکویلەر بەشێوەیەکی کاتیانە تاسـا بـوو، لـە تەنیـشتیدا بـە خـشۆکی دەڕۆشت‌و لەو نزیکانەدا فەنەرێك‌و فلچەیەك‌و قتووە بۆیاخێکی سپی قلپەوەبوو و کەوتبوو. سەگەکان دەستبەجێ ئەلقەیەکیان بـە دەوروبـەری سـکویلەردا دروسـت کردو هەر ئەو دەمەی کە تاقەتی ڕۆشتنی پەیـداکردەوەو بەدرەقـەیان داو بـۆ نێـو خانووی نێـو مەزراکـە بردیانـەوە. هـیچ یـەکێ لـە ئاژەڵـەکان هـیچ ئایدیایـەکی دەربـارەی ئـەوە نەڕسـکاند کـە ئەمـە چـی دەگەیانـد! جگـە لـە بێنجـامینی بەساڵداچوو نەبێت، کە لمۆزی بە هەواو فیزی حاڵی بوونێکەوە لەقاندو بەوە دەچوو تێگەشتبێ، بەڵام هیچی نەدرکاند.

---

Distilling .[168]: دلۆپاندن. چۆڕاندن.

وەلێ چەند ڕۆژێك دواتر میوریەڵ بۆ خۆی دووبارە حەوت ڕاسپاردەکەی دەخوێندەوەو تێبینی ئەوەی کرد کە لە ڕاستیدا یەکێکی تریش لەوانە مابووەوە کە ئاژەڵەکان بە نادروستی وەبیریان هاتبووەوە. وای بۆچوو بوون کە پێنجەمین ڕاسپاردە ئاوابوو (هیچ ئاژەڵێك نابێ ئەلکهول بخواتەوە)، بەڵام دوو وشەی تێدابوو کە لەبیریان چووبۆوە. لە ڕاستیشدا ڕاسپاردە وای ڕادەگەیاند: (هیچ ئاژەڵێك نابێ بە زیادەڕەویکردن ئەلکهول بخواتەوە).

## بەشی نۆیەم

سمە هەڵزڕاوەکەی بۆکسەر ماوەیەکی دووورودرێـژ لـە سـارێژبووندا بـوو. ڕۆژی دوای ئەوەی کە ئاهەنگەکانی سەرفرازبوونیان تەواو ببوو دەسـتیان کردبـووەوە بـە دروستکردنەوەی ئاسیاوەکە. بۆکسەر تەنانەت ئەوەشـی ڕەتکردبـووەوە کـە یـەك ڕۆژ حەسانەوە لە ئیش وەربگرێـتو کردبوویـە مەسـەلەی شـەرەف کـە نـەهێڵێت ئەوە ببینرێت کە لە ئازارچەشتندا بوو. لـە ئێوارەکانـدا بەتایبـەتی بـۆ کلۆڤـەری دەدرکاند کە سمەکەی گەلێك زۆر ناڕەحەتی دەکرد. کلۆڤەر سمەکەی بە کەرەسـەی پێچانی ئەو گژوگیاو ئاڵەتەی کە بە جووینیان ئامادەی کردبوون تیمـاری دەکـردو هەردووکیان خۆیو بێنجامین داوایان لە بۆکسەر کردبوو کە تۆزێك کەمتر سەخت ئیش بکات. (سییەکانی ئەسپێك هەتا هەتایە بەردەوام نابێت) کلۆڤەر پێی وت, بەڵام بۆکسەر گوێی نـەدەگرت. وتـی، تـەنها ئارمـانی ڕاسـتەقینەی ماوەتـەوە-

ئـەویش بەرلـەوەی گەشـتبێ بـە تەمـەنی خانەنـشینی بـە باشـی ئاسـیاوەکە لـە بارودۆخی پێشوەچووندا ببینێـت. لـە سـەرەتاوە کاتێـك کـە یەکـەمجار یاسـاکانی مەزرای ئاژەڵان فۆرمیولا کران تەمەنی خانەنشین بوون بۆ ئەسـپو بـەرازەکان لـە دوانزە ساڵی، بۆ مانگاکان لـە چـواردە سـاڵی، بـۆ سـەگەکان لـە نـۆ سـاڵی، بـۆ مەڕەکان لە حـەوت سـاڵیو بـۆ مریـشكو قازەکـانیش لـە پێـنج سـاڵیدا دیـاری کرابوو. لەسەر مووچەیەکی سـەخاوەتمەندانەی کـاتی خانەنـشینی بەساڵداچـوویی ڕێك کەوتبوون. لە ڕاسـتیدا هـەتا حـاڵی حـازر هـیچ ئاژەڵێـك لەسـەر مووچـەی خانەنـشینی خانەنـشین نـەببوو، بـەڵام لـەو دواییانـەدا مەسـەلەکە زیـاترو زیـاتر گفتوگۆ کرابوو. ئێستاکە ئیدی کێڵگە بچکۆلانەکەی ئەودیوو باخەکە بۆ جۆ وەلا خرابوو، بەندوباو وا بلاوبوو کە سووچێکی پاوانە گەورەکە دەبوو تەیمانـە بکرێـتو بۆ ئاژەڵە لەکارکـەوتووەکان بکرێـت بـە زەمینـەی- لـەوەڕین. ئـەوە وترابـوو کـە هەموو ڕۆژێك مووچەی خانەنشینی بۆ ئەسپێك دەبێتە پێنج پاوەنـد[169] دانەوێڵـەو لە زستانیشدا پازدە پاوەنـد کـا، لەگـەڵ گێزەرێـك, یـاخود لەوانەیـە سـێوێك لـە ڕۆژانــی پــشووە گــشتیەکاندا. وادەی دوانزەهــەمین ســاڵرۆژی لــەدایکبوونی بۆکسەریش لە ئاخروئۆخری هاوینی ساڵی داهاتوودا دەهات.

لـە هـەمان وەختـدا ژیـان دژوار بـوو. زسـتان بـە هـەمان ئەنـدازەی سـاردیی زستانەکەی پێشوو ساردبوو، لـە ڕاسـتیدا خـۆراکیش کـەمتر ببـووەوە. دووبـارە جارێکی تر ئازووخەکان هەموو کەم کرابوونەوە جگـە لـە ئازووخـەی بـەرازەکانو

---

[169]. Pounds: یەکەی کێشە لە ئینگلستان کە بریتیە لە (454) گرام.

سەگەکان نەبێت. سکویلەر ڕوونی کردبۆوە کە یەکسانییەکی زۆر مەحکومو جیددی لە ئازووخەکاندا دەبووە هاودژی پرنسیپەکانی ئاژەڵیزم. بەهەرحاڵ ڕواڵەتەکان هەرچی چۆنێك بووبن، ئەو لەوەدا کێشەی نەبوو کە بۆ ئاژەڵەکانی دیکەی بسەلمێنێ کە لە ڕاستیدا کەموکورتی خۆراکیان نەبوو. بێگومان بۆ حاڵی هەنووکە پەی بە پێداویستی دووبارە ڕێکخستنەوەی ئازووخەکان برابوو (سکویلەر هەمیشە وەکو دووبارە ڕێکخستنەوە لە بارەیەوە دەدواو قەت وەکو - کەمکردنەوە- لە بارەیەوە نەدەدوا)، بەڵام بە بەراوردکاریی لەگەڵ ڕۆژگارەکانی جۆنزدا چاکسازییەکان لەڕادەبەدەر بوون. بەهۆی خوێندنەوەی حیساباتەکانەوە بە دەنگێکی پەلەی زیقن، بە دوورودرێژییەوە بۆی سەلماندن کە خرپووکی زۆرتر، پووشو پەلاشی زۆرتر، شێلمی زۆرتریان هەبوو لەوەی کە ئاوی خواردنەوەکەیان چۆنیەتییەکی باشتر هەبوو، ئەوەی کە درێژتر دەژیان, ئەوەی کە ڕێژەیەکی بەرفراوان تری بێچووەکانیان لە دەورانی زارۆڵەیی دەربازیان دەبوو، ئەوەش هەروەها کە کایەکی زیاتریان لە بەستنگاکانیاندا هەبوو بەدەست مێشو مەگەزیشەوە کەمتر دەچەوسانەوە. ئاژەڵەکان بڕوایان بە هەموو وشەیەکی کردبوو. بەڕاشکاوی جۆنزو هەموو ئەوەی کە ئەو نماینەدەی بوو تەقریبەن لە یادەوەرییەکانیاندا ڕەویبووەوەو ئەوەیان دەزانی کە ژیان ئێستاکێ ناهەموارو تووش بوو، کە زۆرجار برسیو زۆرجارش سەرمایان بوو، هەروەها ئا ئەوەش کە هەرکاتێك نووستوو نەبوونایە هەردەم خەریکی کارکردن بوون، بەڵام گومان هەڵنەگر بوو کە لە ڕۆژگارە گوزەریووەکاندا خراپتر ببوو. خۆشحاڵ بوون کە ئاوا

باوەڕ بکەن, لەگەڵ ئەوەشدا لەو ڕۆژگارانەدا کۆیلە ببوون‌و هەنووکەش ئازاد بوون‌و ئا ئەوە ئەو فەرقە تەواوەی بەرپا کرد کە سکویلەر لە ئاماژەپێدانیدا ناکام بوو. هەنووکە چەندین مانگی دیکەش بۆ خۆراك خواردن هەبوون. لە پاییزدا تەقریبەن هەر چوار مالۆسەکە لە یەك کاتدا زایین، لە نێوانی خۆیاندا سی ویەك تولەبەرازیان هێنایە ئاراوە. تولەبەرازەکان بەڵەك بوون‌و ناپولیۆنیش کە تاقە یەکانەی سەر مەزراکە بوو سیاو بوو کە ئیدی بنەماڵەیان بقەبڵێنرێ. دواتر کاتێ کە خشت‌و تەختە کڕدرا ئەوە ڕاگەیەنرا کە پۆلێکی قوتابخانە[170] لەنێو باخچەی خانووی نێو مەزراکەدا بنیات دەنرێت. بۆ حاڵی حازریش تولەبەرازەکان لەلایەن ناپولیۆن خۆیەوە لەنێو چێشتخانەی خانووی نێو مەزراکەدا ڕێنماییەکانی خۆیان پێ درابوو. مەشقەکانی خۆیان لەنێو باخچەکەدا ئەنجام دەداو یاریکردنیان لەگەڵ ئاژەڵە نەوجەوانەکانی تر لێ بەربەست کرابوو. لەم وەخت‌و ئانەش کە وەکو ڕێسایەك ئەوە ڕاگەیەنرا کاتێ کە بەرازێك‌و هەر ئاژەڵێکی تر لەسەر ڕێگادا پێك بگەن، ئەوا پێویستە ئاژەڵەکەی تر بکشێتە لاوەو هەروەها ئەوەش کە سەرلەبەری بەرازەکان لە هەرچی پلەوپایەیەکدا بووبن دەبووایە لە یەکشەممەکاندا بەسەر کلکیانەوە بەرخورداری پۆشینی شریتی سەوز بن.

مەزراکە تارادەیەك ساڵێکی سەرکەتووی هەبوو، بەڵام هێشتاش کەموکاستی پارەیان شك دەبرد. هێشتا دەبووایە خشت‌و لم‌و قسڵ بۆ پۆلی قوتابخانەکە بکڕابانایەو هەروەها دەبووە پێداویستییەك کە بۆ کڕینی دەزگاکانی

[170]. School room: پۆل، ژووری قوتابخانە.

ئاسیاوەکە، ئینجا نەوتی چراو مـۆم بـۆ خانووەکـە، شـەکر بـۆ مێزەکـەی خـودی ناپولیۆن (کە بۆ بەرازەکانی دی ئەمەی قەدەغە کردبـوو بـە بیـانووی ئـەوەوە کـە قەڵـەوی کردبـوون)و هــەموو جێگیرکردنــەوە ئاســاییەکانی وەکــو ئامێرەکــان, بزمارەکان، گوریس، ڕەژوو، وایەر، وردە- ئاسـنو پـسکیتی سـەگەکان، دووبـارە دەست بکرێتـەوە بـە پاشـەکەوت کـردن. بـەرماوەی کـا و بەشـێکی بـەروبوومی پەتاتەکە فرۆشرا بوو، ڕێکەوتننامەی هێلکەکانیش هەفتەی بۆ شەش سـەد دانـە زیاد کرابوو، لەبەرئەوە ئەو ساڵە مریشکەکان بە سەختی جووجەڵەیان هەڵهێنابوو هەتا ژمارەیان لـە هـەمان ئاسـتدا بهێڵنـەوە. ئازووخـەکان کـە لـە دیـسەمبەردا کەمکرابوونەوە دووبارە لە فێبریوەریدا کەمکرانەوەو بۆ پاشەکەوتکردنی نـەوتیش فەنەر لەنێو بەستنگاکاندا قەدەغە کرابوون, بەڵام بـەرازەکان تاڕادەیـەك ئاسـوودە دیــاربوونو لــە ڕاستیــشدا ئەگــەر هــەر شــتێکیان هەڵبگرتایــە ئــەوا تــەنها سەنگینبوونی خۆیان بوو.

دوانیوەڕۆیـەکی ئـاخرئۆخری فێبریـوەری بـۆنو بەرامەیـەکی گـەرموگوڕو سەخی ئیشتیاهێنی ئـەوتۆ کـە ئاژەڵـەکان پێـشتر هـەرگیز بۆنیـان نـەکردبوو لـە سەرانسەری حەوشەکەدا لە برووـ هاوسە[171] خشپیلانەکەوە خۆی بلند کردەوە کـە لە سەردەمی جۆنزدا پشتگوێ خراوبوو لە پشت چێشتخانەکەشدا بەرقـەرار بـوو. یەکێك وتی بۆنی جۆی کوڵاو بوو. ئاژەڵەکان بە برسێتیەوە هەواکـەیان هەڵمـژیو کەوتنە کەڵکەڵەی ئەوەی ئاخۆ ماشێکی گەرموگوڕ بـۆ شـامیان ئامـادە دەکـرا,

---

[171]. Brew-house: خانووی تایبەتی بۆ تەخمیرکردنی بیرە. جێگای بیرەسازی.

بەڵام ماشی گەرموگوڕ بەدیار نەکەوت‌و لە یەکشەممەی دوای ئەوەدا ئەوە ڕاگەیەنرا کە لە ئێستا بەدواوە هەموو جۆیەکە دەبوو بۆ بەرازەکان بپارێزرێت. کێڵگەکەی ئەودیو باخەکە پێشوەخت بە جۆ چێنرابوو. هەواڵیش هەر زووبەزوو دزەی کردە دەرێ کە گشت بەرازێك ئیدی ڕۆژانە ئازووخەی پاینتێك بیرە وەردەگرێت. لەگەڵ نیو گالۆنیش بۆ خودی ناپولیۆن، کە لە نێو تیوورینی تایبەت بە شۆربای کراوون داڕبی[172]دا پێشکەش دەکرا.

بەڵام ئەگەر گرفت‌و تەنگانە هەبووایە بۆ بەرگەگرتن، تاڕادەیەك بەو ڕاستییە پارسەنگ دەکرا کە ژیان ئێستاکێ شکۆمەندییەکی لەوە مەزنتری هەبوو کە دێرزەمان هەیبوو. ئێستا کۆمەڵە گۆرانییەك، کۆمەڵە گوتارێك، کۆمەڵە کۆڕەوێکی زیاتر هەبوون. ناپولیۆن بڕیاری ئەوەی دا کە دەبێ هەفتەی جارێك شتێك بەناوی ڕێپێوانی خۆڕسکەوە بەرپا بکرێت کە ئامانجەکەی ئەوە بوو ئاهەنگ بۆ تێکۆشانەکان‌و سەرفرازییەکانی مەزرای ئاژەڵان بگێڕن. ئاژەڵەکان لە کاتە دەستنیشانکراوەکەدا دەستبەرداری کارەکانیان دەبوون‌و لە شەقڵێکی سوپاییانە بە دەوروبەری مەزراکەدا ڕێپێوانیان دەکردو دەسوڕانەوە، بەم شێوەیە لە پێشی پێشەوەدا بەرازەکان ئینجا ئەسپەکان، ئینجا مانگاو مەڕەکان، دواجاریش پەلەوەرەکان دەڕۆشتن. سەگەکان ئەملاو ئەولای کۆڕەوەکەیان گرتبوو، لە سەرووی هەمووشیانەوە کەڵەشێرۆکە ڕەشەکەی ناپولیۆن هەنگاوی هەڵدەنا.

---

[172]. Crown Derby Soup tureen: دەفر, یاخود کاسەی تایبەت بە شۆربا کە لە ناوچەی داڕبیدا دروست دەکرا.

بۆکسەرو کلۆڤەر هەمیشە لـە نێوانیانـدا بەیداخـە سـەوزەکەیان هەڵـدەگرت کـە نیشانەی سمو قۆچو سەردێڕی (هەر بژی هەڤاڵ ناپولیۆن)ی بەسەرەوە بوو. دواسـا خوێندنــەوەی ئــەو شــیعرانەی کــە لەســـەر شــەرەفی نــاپولیۆن هۆنرابوونــەوەو گوتارێکیش لەلایەن سکویلەرەوە کە تایبەتمەندییەکانی دواترین زیادبوونەکانی لە بەرهــەمهێنانی کەرەســتەکانی خۆراکــدا پێــشکەش دەکــردو جاروبــاریش لــە تفەنگەکەوە تەقەیەك هەڵدەستێنرا. مەڕەکان مــەزنترین خۆبەختکــەری ڕێپێـوانی خۆڕسك بوونو ئەگەر هەر یەکێك سکاڵای ئەوەی بکردایە (چونکە هەندێك ئاژەڵ جاروبار دەیان کرد، کاتێك کە بەرازو سەگەکان لەو نزیکانە نەبوونایە) کە ئـەوەی دەگەیاند وەختیان لە ڕاوەستانێکی زۆری دەوروبـەرو نـاو ئـەو ساردو سـەرمایەدا بەزایە دابوو، مەڕەکان لەوە دڵنیا بوون کە بە بارەباری نائاسایی (چوار قاچ باشە، دوو قاچ خراپە!) بێ دەنگیان دەکـرد, بـەڵام ئاژەڵـەکان بەگـشتی بـەم ئاهەنگانـە خۆشحاڵ بوون. بۆ ئەوان ئارامبەخش دەردەکەوت وەبیریان بهێنرێتەوە کـە وێـڕای هــەموو شــتێك ئــەوان ســەروەری ڕاســتەقینەی خۆیــان بــوونو ئــەو کــارەش کــە کردبوویان بۆ خێروبێری خودی خۆیان بوو، کەواتــە ئــە ئـاوا بـەهۆی گۆرانیــەکان، کۆڕەوەکـان, لیــستەی ژمێریارییــەکانی ســکویلە، شــریخەی تفەنگەکــە، قووقــەی کەڵەشێرۆکەکەو شەکانەوەی ئاڵاکەوە توانیبوویان ئەوە لەبیر بکەن کـە لانــی کــەم بەشێك لە وەختەکە سکیان بەتاڵ بوو.

له ئەپریلدا جاڕی بە کۆماریبوونی مەزرای ئاژەڵان دراو هەڵبژاردنی سەرۆك کۆمارێکیش بووبە پێداویستی. هەر تەنها یەك تاقە کاندید[173] هەبوو، ناپولیۆن کە بە کۆدەنگی هەڵبژێردرا. لە هەمان ڕۆژدا ئەوە بڵاوکرابووەوە کە کۆمەڵە بەڵگەنامەیەکی تازە دۆزرابوونەوە کە وردەکارییەکی پتریان لەبارەی هاوکاریکردنی سنۆبۆڵ لەگەڵ جۆنزدا ئاشکرا دەکرد. ئێستاش ئیدی دەرکەوتبوو کە سنۆبۆڵ وەکو چۆن ئاژەڵەکان پێشتر وێنایان کردبوو، هەر تەنها دەستپێشکەری ئەوەی نەکردبوو کە لەرێی دەستاوێژی فێڵو تەڵەکەوە شەڕی کاوشێدەکە بدۆڕێنێ, بەڵکو بەئاشکرایی لەبەر جۆنز شەڕی کردبوو. لە ڕاستیشدا ئەو بوو کە فیعلەن ڕابەرایەتی هێزەکانی ئادەمیزادی کردبوو، بەو وشانەی (بژی ئینسانییەت) لەسەر لێوەکانیەوە بۆ نێو شەڕەکە پەلاماری هێنابوو. ئەو زامانەی سەر پشتی سنۆبۆڵیش کە هەندێك لە ئاژەڵەکان هێشتا دەهاتەوە بیریان کە بینیبوویانن بەهۆی دانەکانی ناپولیۆنەوە پێی بەخشرابوون.

لە نێوەندی هاویندا مۆزەری قەلەڕەش دوای بزربوونی چەندین ساڵ، دووبارە لەپڕێکا لەسەر مەزراکەدا بەدیار کەوتەوە. هیچ نەگۆڕا بوو، تا بەحاڵ هیچ کاری نەدەکردو وەك هەمیشەش بەهەمان وروژانەوە لەبارەی کێوی نەباتەوە دەدواو لەسەر کۆتەرەدارێکدا هەڵدەتروشکا، باڵە ڕەشەکانی لێك دەداو هەر کەسێك کە گوێی ڕابگرتایە بە سەعات قسەی بۆ دەکرد. "ئا لەو سەرەدا، هەڤاڵان" بە جیددیەوە دەیوت، بە دەنووکە گەورەکەشی ئیشارەتی بۆ ئاسمان دەکرد- "ئا لەو

[173]. Candidate: مورەشەحکردن، پالاوتن، کاندیدکردن.

سەرەدا هەر لەلایەکەی تری ئا ئەو گەواڵە تاریکەوە کە دەبینی- ئا لەوێدا بەرقەرارە کێوی نەبات، ئەو وڵاتە خۆشەی کە تیایدا ئێمەی ئاژەڵە نەدارەکان هەتاهەتایە لە ڕەنجکێشانەکانمان دەحەسێینەوە" هەتا ئەوەشی ڕاگەیاند کە لە یەکێك لە فڕینە بەرزە فڕەکانی خۆیدا چووە بۆ ئەوێو بینیویەتی کە کێڵگە جاویدانەکانی سێپەرەو لینسیدکەیكو کلۆشەکر لەسەر هێجەکاندا دەڕوێن. چەندەها ئاژەڵ بڕوایان پێکردبوو. وای بۆ چوون کە ژیانیان ئێستاکە برسیو دژوار بوو، ئایا دادوەرانەو هەق نەبوو کە دونیایەکی چێتر لە شوێنێکی تردا بوونی هەبێت؟ ئەو شتەی کە دیاریکردنی ئەستەم بوو هەڵوێستی بەرازەکان بوو هەمبەر بە مۆزەر. هەر هەموویان حەقارەت ئامێزانە ئەوەیان ڕاگەیاند کە هەموو سەربهوردییەکانی لەبارەی کێوی نەباتەوە درۆ بوونو هێشتاش لێیگەڕابوون کە لەسەر مەزراکەدا بمێنێتەوە، ئیش نەکات، ڕۆژ جیلە[174] بیرەیەکیش ئازووخەی ئیزافی هەبێت.

دوای ئەوەی کە سمەکەی چاك بووەوە بۆکسەر لە هەموو کاتێك سەختتر کاری دەکرد. بێگومان هەموو ئاژەڵەکان ئەو ساڵە وێنەی کۆیلە ئیشیان کرد. بێجگە لە کاری ئاسایی مەزراکەو بنیاتنانەوەی ئاسیاوەکە، خانووی قوتابخانەی بەرازە نەوجەوانەکانیش هەبوو کە لە مارچ[175] دا دەستیان پێ کردبوو. هەندێکجار ئەو سەعاتە دوورودرێژانە بە خۆراکێکی کەم و ناتەواوەوە ئەستەم بوو بەرگەی

---

[174]. Gill: یەکەی پێوانەیەکە دەکاتە چارەکە پاینتێك.

[175]. March: مانگی ئازار

بگیرێت, بەڵام بۆکسەر هەرگیز بەلادا نەدەهات. لـە هـیچ شـتێکدا کـە دەیـوت, یاخود دەیکرد هیچ نیشانەی ئەوە نەبوو کە هێـزو تاقـەتی ئـەوەی نـەبوو کـە لـە پێشتردا ببوو. تەنها نەختێك گۆڕابوو، کەوڵەکەی بریقەی کەمتر بـوو لـەوەی کـە زووتر بووبووی، بەوەی دەکرد کە ڕانـە مـەزنـەکانی گرژبووبنـەوە. ئەوانـەی دیکـە وتیان: "کاتێك کە گیای بەهار دەردەکەوێت بۆکسەر خـۆی دەبوژێتـەوە"، بـەڵام گیای بـەهاریش دەرکـەوتو بۆکـسەر قەڵـەوتر نـەبوو. هەنـدێکجار لەسـەر ئـەو هەورازەی دەچووە سەر قوڵلەی کووابیەکـە، کاتێـك کـە ماسـولکەکانی لـە دژی قورسایی هەندێك تاتە بەردی پاناوەردا مەحکەم دەکرد، دیاربوو کە هـیچ شـتێك بەسەر پێیەکانیەوە ڕاینەدەگرت جگە لە ئارەزوو بۆ بەردەوامبوون نەبێت. ئـا لـەو کاتانەدا بینرابوو کە لێوەکانی بـە وشـەکانی (مـن سـەختتر کاردەکـەم) شـەقڵیان دەبەخشی، دەنگی نـەمابووەوە، جـارێکی تـریش کلۆڤـەرو بێنجـامین هۆشـداری ئەوەیان پێدایەوە کـە بەتـەنگ تەندروسـتی خۆیـەوە بێـت، بـەڵام بۆکـسەر هـیچ بایەخێکی نەدا. دوانزەهەمین ساڵڕۆژی لەدایکبوونیـشی لـە نزیکبوونـەوەدا بـوو. بەتەنگ ئەوەوە نـەبوو کـە چـی ڕوویـدەدا بەمـەرجێك بەرلـەوە خانەنـشین بێـت، زەخیرەیەکی چاکی بەرد کەڵەکە بووبێت.

ئێـوارەکی درەنـگ وەختـی هـاوین، بەنـدوباوێکی کتـوپڕ لـە سەرتاسـەری مەزراکەدا بڵاوبووەوە کە شتێك بەسـەر بۆکـسەردا هـاتبوو. بـە تـەنیا ڕۆشـتبوو هـەتاکو بـارە بـەردێك بـەرەو ئاسـیاوەکە بـەکێش بکاتـە خـوارەوە. بێگومـان بەندوباوەکـە ڕاسـت بـوو. چـەند خولـەکێك دواتـر دوو کـۆتر بـە هەواڵەکـەوە بـە

هەڵـەداوان خۆیـان بـە ژووردا کـرد: "بۆکـسەر کـەوتووە! بەسـەر لایەکیـدا درێژبووەو ناتوانێت هەستێتەوە" نزیکەی نیوەی ئاژەڵەکانی سەر مەزراکە بەپەلـە بەرەو تەپۆلکەکە ڕۆشتن کە ئاسیاوەکەی لەسەردا بەرقەرار بوو. لەوێدا بۆکسەر لە مابەینی شەفتەکانی گالیسکەکەدا کەوتبوو، ملی کشابووە دەرەوە، هەتا توانـای ئەوەشی نەبوو کە سەری هـەڵبڕێ. چـاوەکانی بـەجیلوە بـوون، تەنیـشتەکانی بـە ئارەقە تەنرابوون، لە زاریەوە جۆگەلەیەکی باریکەلەی خوێن بازرەقـەی بەسـتبوو. کلۆڤەر لە تەنیشتیدا کەوتـە سـەر ئـەژنۆکانی خـۆی "بۆکـسەر!" هـاواری کـرد، "چۆنیت؟".

"سییەکانمە"، بۆکسەر بە دەنگێکی کزەوە وتی: "گرنگ نیە. لـەو بـاوەڕەدام کە بەبێ من ئیدی ئێوە دەتوانن ئاسیاوەکە تـەواو بکـەن. زەخیرەیـەکی زۆرباشـی بەرد گردبووەتەوە. بەهەرحاڵ هەر تەنها مانگێکی ترم مـابوو بـۆ بەشـداریکردن. ڕاستیت پێ بڵێم پرپەدڵ چاوەڕوانی خانەنشینی خۆم بـووم. لەوانەشـە لەبەرئـەوەی بێنجامینیش هەروەها بەساڵدا دەچێت، لێیگەڕێن هاوکـات خانەنـشین بێـتو بـۆ من ببێتە هاودەم. "پێویستە بێ سێ ودوو هاریکاری وەدەسـت بهێـنین" کلۆڤـەر وتی"، "یەکێك بڕواتو بە سکویلەر بڵێت کە چی ڕوویداوە".

هەموو ئاژەڵەکانی تریش دەستبەجێ بەرەو خانووی نێو مەزراکـە ڕایـان کـرد هەتا هەواڵەکە بە سکویلەر بگەیەنن. هەر تەنها کلۆڤـەر مایـەوە، بێنجـامینیش کە لە تەنیشت بۆکسەرەوە درێژ بوو، بەبێ متەقکردن، بە کلکە درێژەکـەی خـۆی مەگەزەکانی لێی دووردەخستەوە، پاش دەوروبەری چـارەکە سـەعاتێك سـکویلەر

سەرشار بە خەمخۆریو نیگەرانی دەرکەوت. ئـەوەی وت کـە هـەڤاڵ نـاپولیۆن بـە مەینەتییـەکی گـەلێك قووڵـەوە هـەواڵی لـەبارەی ئـەم بەدبەختیـەی یـەکێك لـە وەفادارترین کارمەندەکانی سەر مەزراکـەی پێگەیـشتبوو، خـەریکی ئەنجامـدانی ئامادەکاریەکانی ئەوە بوو کە بۆکسەر بنێرێـت لـە نەخۆشـخانە لـە ویلێنگدۆنـدا چارەسەر بکرێت. ئاژەڵەکان دەربارەی ئەمە نەختێك هەستیان بە نارەحەتی کـرد. تـەنها مـۆلّیو سـنۆبۆڵ نـەبێت هـەرگیز هـیچ ئـاژەڵێکی تـر مەزراکـەی بـەجێ نەهێـشتبوو، حەزیـشیان لـەوە نـەدەکرد کـە بـیر لـەوە بکەنـەوە کـە هەڤاڵـە ناساخەکەیان لەژێر دەستی ئادەمیزادەکاندا بێت. بەهەرحاڵ سکویلەر بـە سـانایی بڕوای پێ هێنان کە دکتۆری ڤێرتەرنەری[176] لە ویلێنگدۆنـدا دەتوانـێ حاڵەتەکـەی بۆکسەر زۆر لەوە ڕەزامەندانەتر چارەسەر بکات کـە دەکرێـت لەسـەر مەزراکـەدا ئەنجام بدرێت. لە دەوروبەری نیو سەعات دواتریش کاتێك کە بۆکسەر تاڕادەیـەك هاتبووەوە سەر خۆی، بە دژوارییەوە هەستابووەوە سەر پێیەکانیو توانیبـووی بـە لەنگینەوە بۆ بەستنگاکەی خۆی بگەڕێتەوە، کە کلۆڤـەرو بێنجـامین پێخـەوێکی باشیان لە کا بۆ تەیار کردبوو.

بۆ دوو ڕۆژی دواتر بۆکسەر هەر لە بەسـتنگاکەی خۆیـدا مایـەوە. بـەرازەکان شووشەیەکی گەورەی دەرمانی پەمەییان ناردبوو کە لـە دۆلابـی داودەرمانـەکانی نێـو گەرماوەکـەدا دۆزیبوویانـەوەو کلۆڤـەریش ڕۆژی دووجـار دوای ژەمـەکان دەرخواردی بۆکسەری دەدا. ئێوارەکانیش لە بەستنگاکەیدا پاڵ دەکەوتو قـسەی

---

176. Veterinary: دکتۆری بەیتاڵ، دکتۆری ئاژەڵان.

لەگەڵدا دەکرد، لە وەختێکدا کە بێنجامین مەگەزەکانی لێی دوورخستەوە بۆکسەر دانی پیادا نا کە نابێت ئەفسوس بۆ ئەوە بخوا کە ڕوویدابوو. ئەگەر بەباشی بێتەوە سەرخۆی وای بۆ دەچێت کە دەشێ سێ ساڵی تریش بژێتو پڕبەدڵیش چاوەدووی ئەو ڕۆژە ئاسوودانەی دەکرد کە لەنێو پەناو پەساری لەوەڕگا گەورەکەدا بەسەری دەبردن. یەکەمجار دەبوو کە دەستبەتاڵی هەبێتو موتالا بکاتو ئاوەزووی خۆی پێش بخات. نیازی وابوو، وتی کە پاشماوەی ژیانی بۆ فێربوونی ئەو دوای بیستو دوو پیتەکەی تری ئەلفوبێ تەرخان بکات. بەهەرحاڵ بێنجامینو کلۆڤەر تەنها دەبوو پاش سەعاتەکانی کار لەگەڵ بۆکسەردا بنو لە ناوەڕاستی ڕۆژیشدا بوو کە ڤانەکە هات بۆئەوەی بیگوازێتەوە. ئاژەڵەکان هەر هەموو خەریکی کار بوون لەژێر سەرپەرشتی بەرازێکدا گژوگیای نێو شێلمەکەیان بنبڕ دەکرد، حەپەسابوون کاتێك کە بێنجامینیان بینی لە ئاقاری بینایەکانی مەزراکەوە بە چوار ناڵەوە دەهات، بەوپەڕی دەنگی خۆی دەیزەڕاند. هەتا ئێستا یەکەمجار بوو کە بێنجامین بەو جۆشو کارتێکراوەییەوە ببینن- بێگومان یەکەمجار بوو کە هەتا ئێستاکە یەکێك لە چوار ناڵەدا بینیبێتی. "خێرا، خێرا" هاواری کرد. "دەستبەجێ وەرن! خەریکە بۆکسەر دەبەن" بەبێ ئەوەی لە بەرازەکەوە چاوەڕوانی فەرمان بکەن. ئاژەڵەکان لەپڕێکا لە کار دابڕانو بە غار بەرەو بینایەکانی مەزراکە گەڕانەوە. بێگومان لەنێو حەوشەکەدا ڤانێکی داخراوی گەورە ڕاوەستابوو، بەهۆی دوو ئەسپەوە ڕادەکێشرا، لەسەر تەنیشتەکەیدا نووسراو هەبوو، پیاوێکیش کە بە ئاگری بن کا دەچوو شەپقەیەکی

پۆپــە- نزمــی بۆولــەڕیی پۆشــیبوو لەســەر جێگــای لێخوڕەکــەدا دانیــشتبوو. بەستنگەکەی بۆکسەریش چۆڵو هۆڵ بوو.

ئاژەڵەکان لە دەوروبەری ڤانەکەدا ئاپۆرەیان بەست. "خودا حافیز، بۆکسەر!" بە کۆرسەوە وتیان "خـودا حـافیز!", "گەمژانـە! گەمژانـە!" بێنجـامین هـاواری کـرد، بـە دەوریانــدا سمکــۆڵی دەکــردو زەوییەکــەی بــە سمــە بــچکۆلەکانی دەکوتایــەوە."گەمژانــە! ئێــوە نــابینن کــە لەســەر تەنیــشتی ئــەو ڤانــەدا چــی نووسراوە؟" ئەوە وێستێکی بە ئاژەڵەکان بەخشیو کشوماتیەك ئەوێی داگرتەوە. میوریەڵ دەستی کرد بـە جینجـەکردنی وشـەکان, بـەڵام بێنجـامین بـەرەو کـەنار پاڵێکی پێوە ناو لە نێوەندی بێ دەنگیەکی بێ سەروشوێندا ئەوەی خوێندەوە:

(ئالفرێد سایمۆندز، سەربڕی ئەسپو کوڵێنەری کەتیرەی ویلینگدۆن فرۆشـیاری کەوڵو ئێسکی هاڕدراو. فەراهەمکەری سەگدان)[] "ئێوە حاڵی نابن کـە ئـەوە چی دەگەیەنێت؟ ئەوانە بۆکسەر بۆ ناکەرەکان دەبەن!".

قیژەیەکی ترسناك لە هەموو ئاژەڵەکانەوە سەری کرد. لەم ئانەدا پیـاوی سـەر سـنووقەکە قامــچی لــە ئەســپەکانی داو ڤانەکــەش بــە ســورتمەیەکی بەلــەز لــە حەوشەکەوە بەرەو دەرەوە کەوتە جووڵە. هەموو ئاژەڵەکان دوای کـەوتن. بەوپـەڕی دەنگی خۆیانەوە دەیان قیژاند. کلۆڤەر بە زۆر ڕێی خۆی بەرەو پێشەوە خۆش کرد.

ڤانەکە خەریك بوو دەکەوتە خێرایی. کلۆڤەر کۆششی کرد هەتا دەسـتو پـێ مەحکەمەکانی خۆی بداتە چـوار ناڵـەو چـوار ناڵەیـەکی خـاوو سـستی بەدەسـت

[] Kennels: کولانەی سەگ. لانە سەگ. سەگدان.

هێنا. "بۆکسەر!" هاواری کرد... "بۆکسەر! بۆکسەر! بۆکسەر!" و هەر ئا لەم ساتەشدا وەکو ئەوەی ئەو جارو جەنجاڵەی دەرەوەی بیستبێ، سەروپۆتەڵاکی بۆکسەر، بە خەتە سپییەکەی خوار لووتیەوە لە پەنجەرەی بچووکی دواوەی ڤانەکەوە بەدیار کەوت.

"بۆکسەر!" کلۆڤەر بە دەنگێکی سامناك هاواری کرد. "بۆکسەر! دەرچۆ دەرەوە! خێرا دەرچۆ دەرەوە! ئەوانە بەرەو مەرگی خۆتت دەبەن!" هەموو ئاژەڵەکان هاواری (دەرچۆ دەرەوە، بۆکسەر، دەرچۆ دەرەوە!)یان دەست پێکردەوە, بەڵام ڤانەکە ئێستاکە ئیدی کەوتبووە خێراییەوەو لەوان دوورکەوتبۆوە. نامالووم بوو ئاخۆ بۆکسەر لەوە تێگەشتبوو کە کلۆڤەر چی وتبوو! بەڵام ساتێك دواتر رووخساری لە پەنجەرەکەوە پێوار ببوو، ئینجا دەنگی نائاسایی لێدانی سمەکانی لەنێو ڤانەکەدا بەرپا ببوون. بە لەقەوەشاندن هەوڵی دەدا خۆی دەرباز بکات. سەروەختێك چەند لەقەیەکی سمەکانی بۆکسەر ڤانەکەی وەکو شقارتە وردوخاش دەکرد، بەڵام حەیف! هێزو تاقەتەکەی پێ نەمابوو، لە چەند ساتێکدا دەنگی تەپەتەپی سمەکانی کزتر بووەوەو ڕەوییەوە. لە ناچاریدا ئاژەڵەکان دەستیان کرد بە پاڕانەوە لەو دوو ئەسپەی کە ڤانەکەیان ڕادەکێشا هەتا بووەستن. "هەڤاڵان، هەڤاڵان" هاواریان کرد. "برای خۆتان مەبەن بۆ مەرگی خۆی"، کەچی چوارپێیە گەمژەکان لەوە زۆر نادانتر بوون کە درك بەوە بکە کە چی ڕوویدەدا، هەر تەنها گوێچکەکانی خۆیان ڕووبە پشتەوە خپ کردو لۆقەیان خێراتر کرد. سەروپۆتەڵاکی بۆکسەریش جارێکی تر لە پەنجەرەکەوە ئیدی پەیدا نەبووەوە. زۆر

درەنگە یەکێك لەوە تێفکری کە بەرەو پێشەوە ڕابکاتو دەروازە پێنج- شیشەکە دابخات، بەڵام لـە گاڤۆکەیـەکی تـردا ڤانەکـە لـەم یانییـەوە گـوزەری کردبـوو بـە گورجوگۆڵیشەوە لە خوارووی جادەکـەوە خـەریکی ونبـوون بـوو. بۆکـسەر ئیـدی هـەرگیز جـارێکی دیکـە نەبینرایـەوە. سـێ ڕۆژ پاشـتر ئـەوە ڕاگەیـەنرا کـە لـە نەخۆشخانە لە ویلێینگدۆندا سەرباری ئەو هەموو جۆرە خزمـەتکردنو بەتەنگـەوە هاتنەی کە هەر ئەسپێکی تریش ڕەنگبوو هەر ئەوەی خواسـتبێت کۆچـی دوایـی کردبوو، سکویلەر هات هەتا هەواڵەکە بەوانی تر ڕابگەیەنێت. ئەو وتی لە کـاتی دوایین سەعاتەکانی بۆکسەر لەوێدا ئامادە ببوو.

"کاریگەرترین دیمـەن بـوو کـە هـەتا ئێـستاکە بینیبێـتم!" سـکویلەر وتـی. سمەکـەی هـەڵبڕیو فرمێـسکێکی سـڕیەوە. "لـەو دوا سـاتەدا لـە تەنیـشت پێخەفەکەیەوە بووم، لە کۆتاییشدا تەقریبـەن زۆر بـێ تـین بـوو کـە قـسە بکـات، ئەوەی بـە گوێـچکەمدا چرپاند کـە تاقـە خـەمو پـەژارەی ئـەوە بـوو کـە بەرلـە تەواوبوونی ئاسیاوەکە مردبێت. "بۆ پێـشەوە، هـەڤاڵان!" بەچرپەوە وتـی: "بـۆ پێشەوە بەناوی یاخیگەرییەکەوە. هەر بـژی مـەزرای ئـاژەڵان! هـەر بـژی هـەڤاڵ ناپولیۆن هەمیشە لەسەر هەقە. ئەمانە دواترین وشەکانی ئەوبوون، هەڤاڵان". ئا لێرەدا سکویلەر لەپڕێکا ڕەفتاری گۆڕا. بۆ ساتەوەختێك کپی دایگرتو بەرلەوەی بەردەوام بێتەوە دزە نیگای بەدگومانەوی چاوە بـچکۆلەکانی لـە لایەکـەوە گرتـە لایەکەی تر. کەوتبووە بەر ئاگای ئەوەوە، سکویلەر وتی کە مقۆمقۆیەکی گەلۆرو شەڕانگێز لە کاتی گواستنەوەی بۆکسەردا بـڵاو ببـوەوە. هەنـدێك لـە ئاژەڵـەکان

تێبینی ئەوەیان کردبوو کە ئـەو ڤانـەی بۆکسـەری بردبـوو بـە (سـەربڕی ئەسـپ) نیشانەدار بوو، زۆر بەپەلـەش بـۆ ئـەو ئەنجامگیرییـە چـووبوون کـە بۆکسـەر بـۆ ناکەرەکان نێردرابوو.

تەقریبەن لەباوەڕبەدەر بوو، سکویلەر وتی کە هەر ئاژەڵێك ئا ئەوەنـە گەمـژە بێت, بێگومان بە شێتگیرییەوە هاواری کرد، کلکی دەجووڵاندەوەو لـە لایەکـەوە بـۆ لایەکـەی تـر هەڵدەبەزییـەوە، بـە دڵنیاییـەوە لـەوە باشـتر شـارەزای پێـشەوا خۆشەویستەکەیان هەڤاڵ ناپولیۆن ببـوون؟ بـەڵام لـە ڕاسـتیدا ڕاڤەکارییەکـە فـرە ئاسـان بـوو. ڤانەکـە بـەر لەوسـا مـوڵکی ناکـەرێك ببـوو، لەلایـەن دکتـۆری بەیتاڵەکەوە کڕ درابوو، کە هێشتا ناوە دێرینەکەی بە بۆیە نەسڕیبووەوە. ئـە ئـاوا بەدحاڵییەکە سەری هەڵدابوو. ئاژەڵەکان بـە بیـستنی ئەمـە لەڕادەبـەدەر دڵنـەوا بوونەوە. کاتێکیش کـە سـکویلەر سـەرومڕ بـووەوە لـەوەی کـە زیـاتر گرافیکـی مووبەمووی سەرەمەرگی بۆکسەر پێشکەش بکات، ئەو بایەخە شایستەیەی کـە پێی درابوو لەگەڵ داودەرمانی گرانبەها کـە نـاپولیۆن بـەبێ بیرکردنـەوە لـەبارەی نرخەوە دابووی، دوا گومانەکانی ڕەواندنەوەو ئەو خەمو پەژارەیەش کە بۆ مەرگی هەڤاڵەکەیان هەستیان پێکردبوو بەو تێفکرینە چارەسازی کرابـوو کـە لانـی کـەم بۆکسەر بە خۆشحاڵییەوە مردبوو.

ناپولیۆن خۆی لە کۆبوونـەوەی سـبەینێ یەکـشەممەی دواتـردا دەرکـەوتو بـە شکۆو شانازی بۆکسەرەوە وتـارێکی کورتیلـەی پێـشکەش کـرد، شـیاو نـەدەبوو ناپولیۆن وتی کە لاشەی هەڤاڵـە شـیوەن بۆکراوەکـەیان بۆئـەوە بهێنایەتـەوە کـە

لەسەر مەزراکەدا کفنو دفن بکرێت، بەڵام دەرخواستی ئەوەی کردبوو کە لە لۆرێڵەکانی[178] باخچەی خانووی نێو مەزراکە تاجەگوڵینەیەکی گەورە دروست بکرێتو بنێردرێتە خوارێ بۆئەوەی لەسەر گۆڕی بۆکسەر دابنرێت. لە ماوەی چەند ڕۆژێکیشدا بەرازەکان بەتەمای ئەوە بوون کە لەسەر شەرەفی بۆکسەردا بانکوێتێکی[179] ڕێزلێنان بەرپا بکەن. ناپولیۆن بە وەبیرهێنانەوەی هەردوو پەندە پەسندکراوەکەی بۆکسەر، (من سەختتر کار دەکەم), (هەڤاڵ ناپولیۆن هەمیشە لەسەر هەقە)ەوە کۆتایی بە گوتارەکەی خۆی هێنا- ئەو پەندانەی وتی کە هەموو ئاژەڵێك چاك دەکات گەر وەکو دروشمی خۆی بیانگرێتە بەر.

لەو ڕۆژەدا کە بۆ بانکوێتەکە دیاری کرابوو، ڤانی بەقاڵێك لە ویلینگدۆنەوە بۆ ئەوێ لێی خوڕی بوو، سنووقێکی تەختەی گەورەی بۆ خانووی نێو مەزراکە هێنابوو. ئەو شەوە لەوێدا دەنگی پڕ سەروسەدای گۆرانی چڕین دەهات، کە ئەوەی بەدوادا هات کە بە دەنگی دەمەقاڵەیەکی توندوتیژی دەکردو لە دەوروبەری سەعات یازدەدا بە وردوخاشبوونی مەزنی شووشەوە کۆتایی پێ هات. هیچ کەسێك بەرلە نیوەڕۆی ڕۆژی دواتر لە خانووی نێو مەزراکەدا جموجوڵی لێوە نەهات. قسەی ئەوەش پەخش بووە کە لە شوێنێك, یاخود شوێنێکی ترەوە بەرازەکان پارەی کڕینی سنووقە ویسکیەکیان بۆ خۆ بەدەست هێنابوو.

---

[178]. Laurel : جۆرە درەختێکە. درەختی ئەلغار.

[179]. Banquet : زیافەتو خوانداری. بەزمو میوانداری.

# بەشی دەیەم

ساڵانێك ڕابوردن. وەرزەكان هاتن‌و تێپەڕین، ژیـانی كورتەڵـەی ئاژەڵـەكانیش ڕەوییەوە. ئەو سـەروەختەش هاتەپێـشێ كـە ئیـدی هـیچ یـەكێك نـەبوو ڕۆژانـی دێرزەمانی پێش یاخیگەرییەكەی وەبیردا بێتەوە، بێجگە لە كلۆڤـەرو بێنجـامین، مۆزەری قەلەڕەش‌و ژمارەیەك لە بەرازەكان نـەبێت. میوریـەڵ مردبـوو، بلـوبێڵ، جێـسی‌و پینـچەر مردبـوون. جـۆنزیش هـەروەها مردبـوو- لـە یـەك خانـەی بەدمەسـتكردنی[180] ناوچـەیەكی دیكـەی شارۆچـكەكەدا مردبـوو. سـنۆبۆڵ لـەبیر كرابوو. بۆكسەریش لەبیر چووبووەوە، هەر تەنها لەلایەن ئەو هەندەوە نـەبێت كـە ناسـیبوویان. كلۆڤـەر ئێـستا ئیـدی مـاینێكی بەساڵداچـووی قەڵـەو بـوو، جومگەكانی سـفت ببـوون‌و چاوەكانیـشی مـەیلی ئاوكردنیـان هـەبوو. دوو سـاڵ تەمەنی خانەنشینی تێپەڕاندبوو، بەڵام لە ڕاسـتیدا فیعلـەن هـیچ ئاژەڵێـك هـەتا

---

. [180] Inebriatess : مەیخانە، خانووی خواردنەوە.

ئێستاکێ خانەنشین نەببوو. ئاخاوتنیش دەربارەی وەلانانی گۆشەو پەنایەك لە لەوەڕگاکەدا بۆ ئاژەڵە کەفتەکارەکان لە زۆر کۆنەوە وازی لێ هێنرابوو ناپولیۆن ئێستاکە ئیدی یەکانەیەکی خەملێووی بیستوچوار ستونی بوو. سکویلەر هێندە قەڵەو ببوو کە بە زۆر دەیتوانی بەردەمی چاوەکانی خۆی بەدی بکات. تەنها بێنجامینی پیر هەر وەکو هەمیشەی خۆی وابوو، هەر تەنها ئەوە نەبێ کە دەوروبەری لمۆزی تۆزقاڵێك بۆرتر هەڵگەڕابوو، هەر لە وەختی مەرگی بۆکسەریشەوە لە گشت کاتێك بێ خولْقتر و خامۆشتر ببووەوە. ئێستا ئیدی مەخلوقاتێکی فرە زیاتر لەسەر مەزراکەدا هەبوون، لەگەڵ ئەوەشدا زیادبوونەکە ئەوەندەش مەزن نەبوو کە وەك لە ساڵەکانی زوودا چاوەڕوان کرابوو. چەندین ئاژەڵ لەدایك ببوون کە یاخیگەرییەکە بۆیان هەر تەنها ترادیسیۆنێکی تەمومژاوی بوو، بە زارەکی پێیان گەشتبوو، هینەکانی دیش کە کڕداربوون هەرگیز پێش هاتنیان ناوبردنی شتێکی ئەوتۆیان نەبیستبوو. مەزراکە ئێستاکێ لەپاڵ کلۆڤەردا خاوەنی سێ ئەسپی تر بوو. کە گیانەوەری زۆرچاكو تەندروست بوون. کارگەری ئارەزوومەندو هەڤاڵی نایابیش بوونو بەڵام بێ ڕادە گەمژە بوون. هیچ یەکێکیان نەیسەلماند کە لە دوای پیتی (B)یەوە توانای فێربوونی ئەلفوبێی هەیە. قبوڵی هەموو ئەو شتانەیان کردبوو کە دەربارەی یاخیگەرییەکەو پرنسیپەکانی ئاژەڵێزمەوە پێیان وترا بوو، بەتایبەتیش لەلایەن کلۆڤەرەوە، کە کەم وزۆر ئوودایەکی باوكو فەرزەندییان بۆی هەبوو، بەڵام ئەوە گومانهەڵگر بوو کە ئاخۆ هەندە لێی حاڵی بووبن. ئێستا ئیدی مەزراکە زۆر بوژاوەترو

دامەزراوەتر ببوو، بە دووی دانە کێڵگەی دیکەش بەرفراوانتر کرابووەوە کە لە مستەر پیلکینگتۆن کڕ درابوون. ئاسیاوەکە لە ئاکامدا سەرکەوتووانە تەواوکرابوو، مەزراکەش خودانی کۆمباینێكو ئەلیڤەیتەرێکی[181] کای تایبەت بە خۆی بوو، چەندین بینایەی نوێشی خرابووە سەر.

وایپەر دۆگ کارتێکی[182] بۆ خۆی کڕیبوو. ئاسیاوەکە بەهەرحاڵ سەرباری هەموو ئەوەش بەکارنەهێنرابوو هەتا هێزی کارەبا بەرهەم بهێنێت. بۆ هاڕینی دانەوێڵە بەکاردەهێنراو قازانجێکی سەخاوەتمەندانەی پارەشی وەدەست دەهێنا. ئاژەڵەکان هێشتاش هەر سەخت لە کاری بنیاتنانی ئاسیاوێکی تردا بوون: کاتێك کە ئەو دانەیە تەواو بوو ئەئاوا وترابوو، ئەوسا داینەمۆکان دادەمەزرێنرێت, بەڵام ئەو ئاسوودەییانەی کە ڕۆژێك لە ڕۆژان سنۆبۆڵ ئاژەڵەکانی فێرکردبوو هەتا خەون بە گلۆپی کارەبایی و ئاوی ساردو گەرمی بەستنگاکانو سێ ڕۆژی هەفتەیەك ئیشکردنەوە ببینن، چیدی دەربارەیان قسە نەدەکرا. ناپولیۆن ئەو جۆرە بیرۆکانەی بەوە مەحکومی کرد کە لەگەڵ ڕۆحیەتی ئاژەڵیزمدا هاودژ بوون. "ڕاستەقینەترین بەختەوەری-، ناپولیۆن وتی لە سەخت کارکردنو گوزەرانی کەم خەرجی دایە".

وێدەچوو وەکو بڵێی بەشێوەیەك لە شێوەکان مەزراکە سەروەتمەندتر ببوو بەبێ ئەوەی خودی ئاژەڵەکان دەوڵەمەندتر بکات- بێگومان جگە لە بەرازەکانو

---

[181]. Elevator: بۆ سەرەوە، بەرەو هەڵگری قورسایی. ڕافیعە.

[182]. Dogcart: گالیسکە.

سەگەكان نەبێت. ڕەنگە هۆی ئەمە تاڕادەیەك بۆ بوونی ژمارەیەكی زۆری سەگەكان بگەڕێتەوە، ئەوەش نەبوو كە ئائەم مەخلوقاتانە بەگوێرەی خۆیان كاریان نەدەكرد. لەوێدا هەروەكو سكویلەر قەت ماندوو نەدەبوو لە لێكدانەوەی كارێكی دوانەهاتوو هەبوو لە سەرپەرشتیكردنو بەڕێوەبردنی مەزراكەدا. بەشێكی زۆری ئەم كارە لەو جۆرە بوو كە ئاژەڵەكانی دیكە زۆر لەوە نادانتر بوون كە تێی بگەن. بۆ نموونە سكویلەر پێی وتن كە دەبووایە بەرازەكان هەموو ڕۆژێك ڕەنجێكی بێچوون لەگەڵ هەندێك شتی نهێنی ئامێز كە پێیان دەوترا (فایلەكان)، (ڕاپۆرتەكان)، (یادنامەكان)و (یاداشتنامەكان)دا بكێشن. ئەمانە پەڕەكاغەزی گەورە گەورە بوون كە دەبووایە بەوردی بە نووسین پڕ بكرێنەوەو هەر زووش كە ئاوا پڕ دەبوونەوە لەنێو كوورەكەدا دەسوتێنران. ئەمە بالاترین بایەخی بۆ خێرو خۆشی مەزراكە هەبوو. سكویلەر وتی بەلام لەگەڵ ئەوەشدا نە بەرازەكانو نە سەگەكانیش بە زەحمەتكێشانی خۆیان هیچ خۆراكێكیان بەرهەم نەهێنا بوو، لەمانەش گەلێك فرە لەوێدا هەبوونو هەمیشەش ئیشتیایان باش بوو, كەچی ئەوانی دیكە ژیانیان پێ بەپێی ئەوەی كە دەیانزانی هەمیشە هەروا ببوو. بەگشتی برسی بوون، لەسەر كا دەخەوتن، لە ئەستێڵەكەدا دەیانخواردەوە، لە كێڵگەكاندا كاریان دەكرد، لە زستاندا بە قارسیو لە هاوینیشدا بە مێشو مەگەز گرفتار بوون. جاروبار بەتەمەنترەكانی میانئەوانە یادەوەرییە كزەكانی خۆیان دەپشكنیو هەوڵیان دەدا هەتا ئەوە یەكالا بكەنەوە كە ئاخۆ لە ڕۆژگارە سەرەتاییەكانی یاخیگەرییەكەدا كاتێك كە هێشتا دەرپەڕاندنی جۆنز تازە ڕوویدا

بوو شتەکان باشتر بوون, یاخود خراپتر بوون. نە دەهاتەوە بیریان هیچ شتێك نەبوو کە ژیانی حاڵی حازری خۆیانی لەگەڵدا بەراورد بکەن. هیچ شتێکیشیان نەبوو بەگوێرەی بڕۆن تەنها لیستەی ژمارە کارییەکانی سکویلەر نەبێت کە بەبێ گۆڕان ئەوەی دەرخست هەموو شتێك باشترو باشتر دەبوو. ئاژەڵەکان پەیان بەوە برد کە گیروگرفتەکە لە چارەسەر بەدەرە، بەهەرحاڵ ئێستا ئیدی کاتێکی کەمیان هەبوو بۆئەوەی لەم جۆرە شتانە خورد بنەوە. هەر تەنها بێنجامینی پیر دانی بەوەدا نا کە مووبەمووی هەر هەموو یانە دوورودرێژەکەی خۆی دێتەوە بیرو دەشزانێ کە شتەکان نە هەرگیز زۆر باشتربوونە نە هەرگیزیش زۆر خراپتر دەبن- برسێتی بێ بەریبوونو ڕەنجەڕۆیی هەر بوونە، ئاوای وت یاسای نەگۆڕەکی ژیان.

وێڕای ئەوەش ئاژەڵەکان هەرگیز دەستبەرداری ئومێد نەبوون. لەوەش بترازێ قەتاوقەت هەتا بۆ چرکەساتێکیش هەستکردنیان بە شانازی بەرخورداریی ئەوەی نەدۆڕاند کە ئەندامی مەزرای ئاژەڵان بوون. هێشتاش لە سەرانسەری وڵاتەکەدا لە هەموو ئینگلستاندا- تاقە مەزرایەك بوو کە لەلایەن ئاژەڵانەوە بەڕێوە دەبراو ئەوان ساحێبی بوون. نەك هەتا تەنها یەکێکیش لەوانە، نەك هەتا جحێڵترینیشیان، نەك هەتا ئەو تازە هاتووانەش کە لە مەزرای دە میل, یاخود بیست میل دوورییەوە هێنرابوون, هەرگیز نەیتوانی بەرامبەر بەوە دەستبەرداری سەرسوڕمان بێت. کاتێك کە بیستیان تفەنگەکە شریخەی لێوە هاتو بینیشیان کە ئاڵا سەوزەکە لەسەر دارئاڵاکە شەکایەوە، دڵیان بە شانازییەکی ئەبەدی

سەرشار بوو، قسەش هەمیشە بەرەو ڕۆژگارە داستان ئامێزە بەسەرچووەکان وەردەچەرخایەوە.

دەرکردنی جۆنز، نووسینەوەی حەوت ڕاسپاردەکان، ئەو شەڕە مەزنانەش کە ئادەمیزادە داگیرکەرەکان تیایدا شکێنرابوون. دەست لە هیچ یەکێ لە خەونە کۆنەکان هەڵنەگیرابوو. ئەو کۆمارە ئاژەڵانەیەی کە مەیجەر پێشبینی کردبوو، کاتێك کە کێڵگە سەوزەکانی ئینگلستان لەلایەن پێی ئادەمیزادەوە هەنگاوی بەسەردا نەنرێت، هێشتاش باوەڕیان پێی بوو ڕۆژێك هەر دەهاتە دی: ڕەنگە بەمزوانە نەبێت، ڕەنگە لەنێو مەودای ژیانی هیچ یەکێك لەو ئاژەڵانەدا نەبێت کە ئێستاکە زیندەگی دەکەن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر دەهاتە دی. هەتاکو دەشیا نەوای (گیانەوەرانی ئینگلستان)یش بە نهێنییەوە لەملاو لەولادا ناڕەنارِ بکرێت. لانی کەم ڕاستییەك بوو کە هەموو ئاژەڵێك زاتی نەدەکرد کە بە دەنگی بەرز بیچڕێت. ڕەنگە بەهۆی ئەوەوە بووبێت کە ژیانیان دژوار بوو ئەوەش کە هەر هەموو هیواکانیان وەدی نەهاتبوو، وەلێ لەوەش بەئاگا بوون کە وەکو ئاژەڵەکانی تر نەبوون. ئەگەر ئەوان برسیان بووایە ئەوە لەبەرئەوە نەبوو کە ئادەمیزادە ستەمکارەکانیان دەرخوارد دەدا، ئەگەر سەخت کاریان بکردایە ئەوە لە کەمە بۆ خۆیان کاریان دەکرد. لەمیانیاندا هیچ مەخلوقێکیش هیچ مەخلوقێکی تری بە (ئەربا) بانگ نەدەکرد، هەموو ئاژەڵەکانیش یەکسان بوون.

ڕۆژێك لە سەرەتای هاویندا سکویلەر فەرمانی بە مەڕەکانی دا کە دوای بکەونو بۆ دەرەوە بۆ سەر پارچە زەوییەکی سەرەنوێڵکی لایەکەی تری مەزراکە

بردیانی، کە بە نیهاڵی بیرچ[183] تەنرابوو. لەوێدا مەڕەکان بەوەی کە بەسەر گەڵاکانەوە خەریکی لەوەڕین بوون هەموو ڕۆژەکەیان لەژێر سەرپەرشتی سکویلەردا بەسەر برد. ئەو خۆی ئێوارێ بۆ خانووی نێو مەزراکە گەڕایەوە، بەڵام لەبەرئەوەی کە کەشوهەواکەی گەرم بوو بە مەڕەکانی وت هەتا هەر لە شوێنەکەی خۆیاندا بمێننەوە. ئەوە بە مانەوەی هەفتەیەکی تەواوی ئەوان لەوێدا کۆتایی پێهات کە بەدیێژایی ئەو کاتە ئاژەڵەکانی تر هیچ ئەوانیان نەبینی. سکویلەر بەشێکی مەزنی هەموو ڕۆژێك لە گەڵیاندا بوو، ئەو، وتی: فێری گوتنی گۆرانیەکی تازەی دەکردن، لەبەرئەوە ئەوە بوو کە دوورەپەرێزیی پێویست بوو. هەر دوای گەڕانەوەی مەڕەکان بوو، لە ئێوارەیەکی خۆشدا کە ئاژەڵەکان کاریان تەواو کردبوو و ڕێیان گرتبوەبەر بەرەو بینایەکانی مەزراکە بگەڕێنەوە، کە دەنگی کوڕژنی ئەسپێکی تۆقیوو لە حەسارەکەوە هات. ئاژەڵەکان بە ڕاچەنیووی لە ڕاگوزەرەکانی خۆیاندا وەستان، ئەوە دەنگی کلۆڤەر بوو. دووبارە حیلاندیەوەو هەموو ئاژەڵەکان دایان لە چوار ناڵەو بەرەو حەسارەکە هەڵپەیان کرد. ئەوساکێ ئەوەیان بینی کە کلۆڤەر بینیبووی.

بەرازێك بوو بەسەر قاچەکانی پاشەوەیدا دەڕۆشت.

بەڵێ سکویلەر بوو. بە تەرزێکی کەمێك گەمژانەوە، وەکو ئەوەی زۆر ڕانەهاتبێ هەتا بارستاییە گەورەکەی خۆی ئا لەو بارەدا ڕاگیر بکات، بەڵام لە سەرانسەری حەسارەکەدا بە هاوسەنگییەکی تەواوەوە پیاسەی دەکرد.

---

[183]. Birch: درەختی بەتوولا. درەختی قان.

چرکەساتێك دواتر لە دەرگای خانووی نێو مەزراکەوە ڕیزێکی دووردرێژی بەراز هاتنە دەرەوە، هەر هەموو بەسەر قاچەکانی پاشەوەیاندا دەڕۆشتن. هەندێك لەوانی تر باشتر ئەنجامیان دەدا، هەتا یەك دووانێکیشیان نەختێك لەرزۆك بوون و بەوەش دەچوو وەك بڵێی حەز لە کۆمەکی دارێك بکەن، بەڵام هەر یەکێ لەوان سەرکەوتووانە ڕێك بە دەوری حەسارەکەدا ڕێی گرتبووە بەر, لە ئاکامیشدا لورەلوری نائاسایی سەگەکان و قووقەی توندوتیژی کەڵەشێرۆکە ڕەشەکە بەرزبۆوەو خودی ناپولیۆنیش هاتە دەرەوە، قەراڵانەو قیتو قۆز نیگا بابیەکانی لە لایەکەوە دەگرتە لایەکی ترو سەگەکانیشی لە دەوربەریدا هەڵبەزو دابەزیان دەکرد.

لەنێو سمەکەشیدا قامچیەکی هەڵگرتبوو.

بێ دەنگییەکی مەرگ ئامێز بەرپابوو. حەپەساو, تۆقیوو، بەیەکەوە چەسپیوو، ئاژەڵەکان لە قەتارەی درێژی بەرازەکان ڕامابوون کە بە دەوروخولی حەسارەکەدا بە هێواشی هەنگاویان دەنا. وەك بڵێی دنیا ئاوەژوو هەڵگەڕابێتەوە، ئینجا ئەو ساتە هات کە یەکەمین شۆك ڕەوییەوەو کاتێکیش سەرباری هەر هەموو شتێك- سەرباری زراوچوونیان لە سەگەکان و لەو خەسڵەتەش کە لە سەرانسەری ساڵە دوورودرێژەکان وەخۆیان گرتبوو، کە هەرگیز سکاڵا نەکەن، هەرگیز ڕەخنە نەگرن، هەرچیەکیش ڕوویدەدا گرنگ نەبوو- ڕەنگە هەرچەند وشەیەکی نارەزاییان دەربڕیبێ, بەڵام هەر لەو ساتەوەختەدا وەکو بڵێی بە ئیشارەتێك، هەر هەموو مەڕەکان لەپڕێکا کەوتنە دەرپەڕاندنی باڕەباڕی

نائاسایی وتیان: "چوار قاچ باشە، دوو قاچ باشترە! چوار قاچ باشە! چوار قاچ باشە، دوو قاچ باشترە!" ئەمە بەبێ وەستان بۆ پێنج دەقیقە بەردەوام بوو. لە کاتێکیشدا کە مەڕەکان دامرکانەوە ئیدی هەلی دەربەڕاندنی هیچ جۆرە نارەزاییەك نەمابووەوە، چونکە بەرازەکان بە هەنگاونان بەرەو خانووی نێو مەزراکە گەڕابوونەوە.

بێنجامین هەستی کرد لمۆزێك بە شانیدا دەماڵرێت. بە دەوروبەردا هەڵیڕوانی کلۆڤەر بوو. چاوە بەساڵداچووەکانی لە هەموو کاتێك بێ نوورتر دەردەکەوتن. بێئەوەی هیچ شتێك بڵێت بە ناسکییەکەوە یاڵی ڕاکێشاو بە دەوردا هەتاکو کۆتایی تەویلە گەورەکە پێشی کەوت، کە حەوت دانە ڕاسپاردەکانی تیادا نووسرابوونەوە. بۆ یەك دوو خولەك وەستان لە دیوارە ئەسفەڵتاویە بە سپی نووسراوەکە ئەبلەق بوون.

"چاوم کزبووە" ئاکام وای وت. "هەتا کاتێك کە جحێڵیش بووم نەمدەتوانی ئەوەی لەوێدا نووسرابوو بیخوێنمەوە، بەڵام بۆ من وادەردەکەوێت کە ئەو دیوارە بە جیاواز دەچێت. ئایا حەوت دانە ڕاسپاردەکە هەر ئەوانەی جارانی زوون، بێنجامین؟" چونکە هەر تەنها ئەمجارە بێنجامین ڕازی بوو ڕێساکەی خۆی بشکێنێ‌و بە دەنگی بەرز هەرچی لەسەر دیوارەکەدا نووسرابوو بۆی خوێندەوە. ئێستاکە ئیدی هیچ شتێك لەوێدا نەبوو جگە لە تاقە ڕاسپاردەیەك نەبێت کە ئاوا ڕەچەی دەگرت:

هەموو ئاژەڵەکان یەکسانن

بەڵام هەندێ ئاژەڵ لەوانی تر یەکسانترن.

لـە دوای ئـەوەوە ئیـدی سـەیر نـەبوو کـە ڕۆژی دواتـر ئـەو بەرازانـەی کـە سەرپەرشتی ئیشی مەزراکەیان دەکـرد هـەر هـەموو قامـچیان لـەنێو سمەکانیـدا هەڵگرتبوو. ئیدی سەمەرە نەبوو کە پەی بەوە ببرێت کـەوا بـەرازەکان بـۆ خۆیـان دەزگایـــەکی ڕادیۆیـــان کڕیبـــوو، بـــۆ دامەزرانـــدنی تەلـــەفۆنیش خـــەریکی ئامادەکاریـەکان بـوونو ئابوونـەیان لـە جـۆن بـووڵ[184] تیـت- بیـت[185]و دەیلـی میرەر[186]دا کرد. ئیدی سەیر نەبوو کاتێك کە ناپولیۆن لـە باخـچەی خـانووی نێـو مەزراکەدا بینرابوو بە پایپێکەوە لە زاریدا پیاسەی دەکرد- نا نـەخێر نـەك هـەتا ئـەو کاتـەش کـە بـەرازەکان جلوبەرگـەکانی مـستەر جۆنزیـان لـە کەنتۆرەکـەدا دەرهێناو لە بەریان کـردن، خـودی نـاپولیۆنیش لـە پاڵتۆیـەکی ڕەشو ڕاتکاچـەر بـریچ[187]و لێگینگـە[188] چـەرمەکاندا دەردەکـەوت، لـە کاتێکـدا کـە مالۆسـە

---

□□□. John Bull : ڕەمزو سیمبولّی ئینگلیزی نموونەیی. ناوی کاراکتەرێکیشە کە نمایندەی نەتەوەی ئینگلیزە. لە کتێبی هەجووی (Lawisa Bottom less pit 1712) جەی ئاربوو سنۆتدا سەرچاوەی گرتووە.

185. Tit-Bits : بلاّوکراوەی بەندوباوو هەواڵە سەیروسەمەرەکان.

□□□. Daily Mirror : ڕۆژنامەیەکی ناوداری ئینگلستانەو لە لەندەن دەردەچێت.

□□□. Rateatcher breech : جۆرە پاڵتۆیەکی کورتە.

188. Leggings : دەرەلینگانە، تاقە لینگی پانتۆڵ کە بەجیا بەسەر پانتۆڵی دیکەدا لەپێ دەکرێت.

پەسەندەکەی لە کراسێکی ئاوریشمی شەپۆڵداردا دەردەکەوت کە مسس جۆنز لـە یەکشەممەکاندا ڕاهاتبوو بیپۆشێت.

هەفتەیەك دوای ئەوە، لـە دوای نیوەڕۆیەکـدا ژمارەیـەك دۆگ کـارت ڕوو لـە مەزراکە ئاژوایان. نمایندەی مەزرادارە هاوسـێکان بـوون بـۆ گەشـتێکی پـشکنین دەعوەت کرابوون. سەرانسەری مەزراکەیان پێ نیـشان دراو مـەزنترین ستایـشیان بۆ ئەو شتانە هەر هەمووی گـوزارە کـرد کـە بینیـانن, بەتایبـەتیش ئاسـیاوەکە. ئاژەڵەکان خەریکبوون کێڵگەی شێلمەکەیان لە گژوگیای زیانـدار پـاك دەکـردەوە. بە بەردەوامی کاریان دەکردو بەدەگمـەن چڕوچـاویان لـە عـەرزەکـەوە هەڵـدەبڕیو نەیاندەزانی ئاخۆ ئیدی زیاتر لە بەرازەکان, یاخود زیاتر لە ئادەمیزادە میوانـەکان سڵ بکەنەوە. ئەو ئێوارێیە دەنگی بڵندی حیلکەحیلكو دەرپەڕانـدنی گـۆرانی لـە خانووی نێو مەزراکەوە بەرز دەبووەوە, ناگـەهانیش بـە دەرکـەوتنی دەنگـە تێـك قژاوەکان لاپڕەسەنیی ئاژەڵەکانی داگرتبۆوە. ئـاخۆ دەبـێ لەوێـدا چـی ڕووبـدات؟ ئێستاکە بۆ یەکەمین جار بوو ئاژەڵەکانو ئادەمیزادەکان لە بارودۆخی یەکـسانیدا کۆدەبوونەوە؟ بەیەك هەماهەنگییەوە تا دەلوا بـە هێواشـی دەسـتیان کردبـوو بـە پێدزەکردن بۆ نێو باخچەی خانووی نێو مەزراکە.

لەبەردەم دەروازەکەدا ئێستیان گرت، تاڕادەیەك- ترساو لـەوەی کـە بـەردەوام بن، وەلێ کلۆڤەر ڕێی چوونە ژوورەوەی وەپێش گرت. هـەتاکو خانووەکـە لەسـەر نووکی پێ ڕۆشتنو ئاژەڵانی ئاوا بە ئەندازەیـەك بـەرز بـوون لـە پەنجـەرەی ژووری نانخوارنەکەوە لە ژوورەوە ڕامـان. لـەوێ لـە دەوری مێـزە درێژەکـەدا نیـو دەرزەن

مەزرادارو نیو دەرزەنیش لە بەرازە پایەدارترەکان دانیشتبوون، خودی ناپولیۆن جێگای شەرەفی لە سەری سەرەوەی مێزەکەدا داگیرکردبوو. بەرازەکان بە ئاسوودەییەکی تەواوەوە لەسەر کورسیەکانی خۆیاندا بەدیار دەکەوتن. سەرنشینەکان سەرگەرمی یاری کاغەز بوون, بەلاّم بۆ ئەو ساتەوەختە ڕایان گرتبوو، بە ڕوونو ئاشکرایی بۆ خواردنەوەی تۆستێك[189]، سوراحیەکی گەورە خەریکی ئەم دەستو ئەو دەستکردن بوو، مەگگەکانیش[190]دووبارە لە بیرە تژی کرابوونەوە. هیچ کەسێك تێبینی دەموچاوی حەپەساوی ئاژەڵەکانی نەکرد کە لەبەر پەنجەرەکەدا سەیری ژوورەوەیان دەکرد.

مستەر پیلکینگتۆنی فۆکس ود مەگگەکەی بەدەستەوە بوو هەستابووە سەرپێ. لە چرکەساتێکدا وتی داوا لە سەرنشینە ئامادەبووەکان دەکات هەتا تۆستێك بخۆنەوە، بەلاّم بەرلە ئەنجامدانی ئەوە چەند وشەیەك هەبوو کە هەستی دەکرد وتنیان ئەرکی سەرشانی ئەو بوو.

بۆ ئەو سەرچاوەی خۆشنودییەکی بێ هاوتا بوو، وتی-و خاترجەمیش بوو کە ئامادەبووەکانی تریش- هەست بەوە بکەن کە ئێستاکە ئیدی دەورانی دووردرێژی بەدگومانیو بەدحالّیبوون کۆتایی پێ هاتبوو. سەردەمانێك نەك هەر خۆی، یاخود هەر یەکێ لە سەرنشینە ئامادەکان بەشداری ئەو چەشنە هەستو

---

[189]. Toast : بە خۆشیو سلاّمەتی ئیتران خواردنەوە, پێك لەیەکدانو نۆشکردنی ئەلکهول بە تەندروستی ئیتران.

[190]. Mug : پەرداخی زلخۆی دەسکدار.

سۆزەیان کردبوو, بەڵکو سەردەمانێك ساحێبە ڕێزدارەکانی مەزرای ئاژەڵانیش نەیتوانی بڵێت بە دوژمنایەتییەوە، بەڵکو لەوانەبوو بڵێت تارادەیەك لەلایەن ئادەمیزادە هاوسێکانی خۆیانەوە بە جۆرە گومانێکەوە تەماشا کرابوون. سەرهاتی بەدشانسانە ڕوویاندابوو، بیرۆکە ناڕاستەکانیش باوبوون. هەست بەوە کرابوو کە بوونی مەزرایەك کە لەلایەن بەرازەوە هەڵدەسووڕێنراو ساحێبی بوون بەشێوەیەك لە شێوەکان ناوازە بوو بەرپرسیاریش بوو لەوەی کە کاریگەرییەکی بێ سەقامی لەسەر دەڤەرەکەدا هەبێت. مەزرادارێکی فرە زۆر، بەبێ سەنگوسووژی گونجاو وایان دانابوو کە لەسەر مەزرایەکی ئەئاوادا ڕۆحیەتی بێ بەندوباریو بێ دیسپلینی باڵادەست دەبێت. دەربارەی ئەو کاریگەرییانە لەسەر ئاژەڵەکان خۆیان، یاخود هەتاکو لەسەر مرۆڤە کارمەندەکانی خۆشیاندا نیگەران ببوون، بەڵام ئێستاکە ئیدی ئەم گومانانە ڕەویبوونەوە. ئەمرۆ خۆیو هاوڕێکانی سەردانی مەزرای ئاژەڵانیان کردو هەموو ئینجێکیشیان بە چاوانی خۆیان پشکنیو چیشیان بەدی کرد؟ نەك هەر تەنها هاوچەرخترین میتۆدەکان، بگرە دیسپلینو ئەو ڕێکوپێکیەش کە دەبێ بۆ هەر هەموو مەزرادارەکان هەموو شوێنێك سەرمەشق بێت. لەوباوەڕەشدا بوو کە لەسەر هەقبوو ئەوە بڵێت کە ئاژەڵە نزمترەکانی سەر مەزرای ئاژەڵان کاری زیاتریان دەکردو لە هەر یەکێ لە ئاژەڵەکانی شارۆچکەکە خۆراکی کەمتریان بەردەکەوت. بێ گومان ئەمرۆ خۆیو ئاواڵە- میوانەکانی دیکە چاودێری گەلێك تایبەتمەندێتیان کردبوو کە نیازیان وابوو یەکاویەك لە مەزراکانی خۆیاندا بیخەنە کار.

بەوە کۆتایی بە تێبینیەکانی خۆی دەهێنێ، وتی کە جارێکی دی جەخت لەسەر ئەو هەستە دۆستانەیە بکات کە هەیەو پێویستیشە لەنێوانی مەزرای ئاژەڵانو دراوسێکانیدا هەر بمێنێ. لەنێوانی بەرازو ئادەمیزاددا بەهیچ جۆرێك پێکادانی بەرژەوەندی نەبووەو نابێ هەشبێ. تێکۆشانەکانو دژوارییەکانیان یەك شت بوون. ئاخۆ کێشەو بەرەی کارو زەحمەتکێشان لە هەموو جێگایەکدا هەر هەمان شت نەبوو؟ ئالێرەدا ئەوە بەڕوونو ئاشکراییەوە دەرکەوت کە مستەر پیلینگتۆن خەریکبوو هەندێ نووکتەی بە دەیقەتەوە- ئامادەکراو بەسەر سەرنشینەکاندا دەرپەڕێنێ، بەڵام بۆ گاڤۆکەیەك خۆشحاڵی هێندە دایگرتبوو وێنەدەچوو توانای وتنی هەبێت. پاش چەپاندنێکی زۆر کە لەمیانیدا چەناگە گۆڕەکەکەی ئەرخەوانی هەڵگەڕا، توانی دەریپەڕێنێتە دەرەوە: "ئەگەر ئینگۆ ئاژەڵە نزمترەکانی خۆیان هەبێت بۆئەوەی بەربەرەکانیان لەگەڵدا بکەن" وتی "ئەوا ئێمەش چینی نزمتری خۆمان هەیە" ئەم وتەزا کارامەیە مێزەکەی خستەباری کەڕەلاوژەوەو مستەر پیلکینگتۆنیش جارێکی دی دەستخۆشی لە کەمی ئازووخەکان، دووردرێژیی سەعاتەکان- کارکردنو ئەو پێوارییە تەواوەی نازونووزکردنیش کە لەسەر مەزرای ئاژەڵاندا چاودێری کردبوو لە بەرازەکان کرد.

ئێستاکەش لە کۆتاییدا وتی داوا لە سەرنشینان دەکات کە هەستنە سەر پێیەکانیانو خۆیان لەوە ئەرخەیان بکەن کە پەرداخەکانیان ژاوە بوو. "ڕێزدارینە" مستەر پیلکینگتۆن درێژەی دابێ. "ڕێزدارینە تۆستی بخۆینەوە: بۆ سەرکەوتوویی مەزرای ئاژەڵان".

پێکوتانو شادیو هاوارێکی بەپەرۆش بەرپا بوو. ناپولیۆن هێندە خۆشنود بوو جێگاکەی خۆی بەجێ هێشتو بەدەوری مێزەکەدا هات هەتا مەگگەکەی خۆی لە هینەکەی مستەر پیلکینگتۆن بدات بەرلەوەی کە چۆڕپڕی بکات. کاتێکیش کە شادیو هەڵڵاکەی خامۆش بۆوە، ناپولیۆن کە لەسەر قاچەکانیدا ڕاوەستاو مابووەوە، ڕایگەیاند کە ئەویش هەروەها چەند وشەیەکی بۆ وتن هەیە. وەکو هەر هەموو گوتارەکانی ناپولیۆن، پوختو بەجێ بوو، ئەویش هەروەها وتی شادحاڵبوو کە دەورانی بەدحاڵیبوون دوایی پێ هاتبوو، بۆ ماوەیەکی دووردرێژ مقۆمقۆی ئەوەی کە سۆنگەی تێفکرینی ئەوەشی هەبوو، کە وا بیربکاتەوە لەلایەن دوژمنێکی شەڕخوازەوە بڵاوبووەوە- کە شتێکی گێرەشێوێنو لە ڕاستیشدا شۆڕشگێڕانە لە سەرو شکڵی خۆیو هاوکارەکانیدا هەبوو. شانازی ئەوەیان پێ درابوو کە لەمابێنی ئاژەڵەکانی مەزرا دراوسێکاندا بەتەمای خرۆشاندنی یاخیگەریی بوون. هیچ شتێك لە ڕاستییەوە لەمە دوورتر نابێت! تاقە ئارەزووی ئەوان ئێستاو لە ڕابردووشدا ئەوە بوو کە لەگەڵ دراوسێکانیاندا لە ئاسوودەییو پەیوەندی بازرگانی ئاساییدا بژین. ئەم مەزرایەی کە ئەو خۆی شەرەفی کۆنترۆڵکردنی هەبوو درێژەی دایێ، پڕۆژەیەکی هەرەوەزی بوو قەباڵەی- موڵکێتیەکانیش، کە لەژێردەستی خۆیدا بوون بەرازەکان هەموو پێکەوە خاوەنی بوون.

باوەڕی نەدەکرد، وتی کە هیچ یەکێ لە بەدگومانییە کۆنەکان هێشتاش مابنەوە، بەڵام بەو دواییانە هەندێك گۆڕانکاری لە ڕۆتینی[191]مەزراکەدا بەئەنجام گەیەنرابوو کە دەشیا لەوەش زیاتر کاریگەری ئەوەی هەبێت کە ڕەواج بە متمانەکردن بەخۆ بدات. هەتا ئێستاکە ئاژەڵەکانی سەر مەزرا لە ڕاستیدا نەریتی کەوەنانەی بە (هەڤاڵ) بانگکردنی یەکتریان هەبوو. ئەمە دەبووایە سەرکوت بکرێت، هەروەها نەریتێکی زۆر سەیریش هەبوو، کە سەرچاوەکەی نەزانرابوو، ئەویش ڕێپێوانی بەیانیان هەموو یەکشەممانێك بوو بەتەنیشت کەللەسەری یەکانەیەکدا کە بە دیرەگێکی نێو باخچەکەدا بە بزمار کوترابوو. ئا ئەمەش هەروەها دەبووایە سەرکوت بکرێتو کەللەسەرەکەش پێشوەخت بنێژرێت. لەوانەیە هەروەها میوانەکانی ئاڵا سەوزەکەشیان بینیبێ کە لەسەر دارئاڵاکەدا دەشەکایەوە، جا ئەگەر وابێ ڕەنگە تێبینی ئەوەشیان کردبێ کە سمە سپییەکەو قۆچەکەش لەگەڵیدا کە بەر لەوسا نیشانە کرابوون ئێستا ئیدی لابرابوون. لە ئێستاکەش بەدواوە دەبووایە هەر ئاڵایەکی سەوزی سادە بێت.

وتی تەنها یەك ڕەخنەی هەیە کە لە گوتارە دانسقەو هاوسێیانەکەی مستەر پیلکینگتۆنی بگرێت. مستەر پیلکینگتۆن سەرانسەری گوتارەکەی ئاماژەی بە مەزرای ئاژەڵان دەدا. بێگومان نەدەکرا بزانێت, چونکە ئەو خۆی ناپولیۆن هەر تەنها ئێستاکە بۆ یەکەمین جار ڕایدەگەیاند- کە ناوی مەزرای ئاژەڵان ئیدی

---

[191]. Routine : شتی دووبارەکراوەی نەگۆڕ. هەمان تەرزە بابەتو شت ئەنجامدانەوە.

هەڵگیرابوو. لەمەودوا مەزراکە دەبووایە بە مەزرای مانەرەوە بناسرێت، کە باوەڕی وابوو ناوی ڕاستەقینەو ئۆریژینالی[192] خۆی بوو.

"ڕێزدارینە" ناپولیۆن درێژەی دایێ، "منیش هەروەکو ئەوەی پێشوو تۆستێکی خواردنەوەتان دەدەمێ، بەڵام لە شێوازێکی جیاوازدا. پەرداخەکانتان لێوانلێو پڕ بکەن. ڕێزدارینە ئەمەیە تۆستەکەی من بۆ سەرکەوتوویی مەزرای مانەر".

هەروەکو پێشوو هەمان بەزموسەفا حەماسیانەکە بەرپا بووەوە، مەگگەکان تا بن خاڵی کرانەوە, بەڵام وەکو کاتێك کە ئاژەڵەکان لە دەرەوەڕا دەیانڕوانیە دیمەنەکە، بۆ ئەوان بەوە دەچوو کە هەندێ شتی سەیروسەمەرە خەریکی ڕوودان بوون، چی بوو ئەوەی کە لە ڕووخساری بەرازەکاندا گۆڕابوو؟ چاوەکزە پیرەکانی کلۆڤەر بەلەز لە چڕوچاوێکەوە بۆ چڕوچاوێکی دی هەڵپەی دەکرد. هەندێکیان پێنج، هەندێکیان چوار، هەندێکیان سێ چەنگەیان هەبوو, بەڵام چی بوو ئەوەی کە وەك بڵێی خەریکبوو دەتوایەوەو دەگۆڕا؟ ئەوساکە کەفزە نانەکە کۆتایی پێهات سەرنشینەکان کاغەزەکانی خۆیان گرتەوە دەستو لەو یارییە بەردەوامبوونەوە کە لێیان تێکدرابوو، ئاژەڵەکانیش بەبێ دەنگییەوە پێدزەیان کردو دوورکەوتنەوە, بەڵام بیست یاردە نەڕۆشتبوون کە لەپڕێکا وەستان. گەرەلاوژەی دەنگەدەنگ لە خانووی نێو مەزراکە بلند بووەوە. بەپەلە گەڕانەوەو دیسانەوە لە پەنجەرەکەوە کەوتنە ڕوانین. بەڵام دەمەقاڵەیەکی زۆر توندوتیژ

---

Original: □□□. ئەسڵی.

خەریکی پەلوپۆهاویشتن بوو، کۆمەڵە هاوارکردنێك، کۆمەڵە بە مێزدا کێشانێك، کۆمەڵە نیگایەکی تیژی بەدگومانی، کۆمەڵە حاشاکردنێکی تووڕانە لەئارادا بوون. بەوە دەچوو کە سەرچاوەی گێروگرفتەکە ئەوە بێت کە ناپولیۆنو مستەر پیلکینگتۆن بەرێکەوت هەردووك هاوکات کاغەزی ئاسی سپەیدیان[193]یاری کردبوو.

دوازدە دەنگ بە تووڕەییەوە هاواریان کردو هەر هەموویان وەکو یەك وابوون. ئێستاکە ئیدی پرسی ئەوە نەبوو کەچی بەسەر دەموچاوی بەرازەکاندا هاتبوو. مەخلوقاتەکانی دەرەوە لە بەرازەوە بەرەو مرۆڤ و لە مرۆڤیشەوە بەرەو بەرزاو دووبارە لە بەرازەوە بەرەو مرۆڤ سەیریان کرد, بەڵام ئیدی مەحاڵبوو کە بزانرێت کامە کامە بوو!.

نۆڤەمبەری **1943**- فێبریوەری **1944**.

کۆتایی

---

ئاس، یاخود برلی- ماچە. کارتی یاریکردن کە تەنها یەك خاڵی ماچەی تێدایە Ace of : . spades .[193]